نـــــــــاوی کتێب: القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى.
دانـــــــــــــــراوی: شێخ محمد صالح العثيمين.
وەرگێـــــــــــڕانی: د. إحسان برهان الدين.
نۆرەو سـالّی چـــاپ: یەکەم، ساڵی ٢٠٢٣.
ژمـارەی سپــــاردن: ( )ی ساڵی (٢٠٢٣) ی پێدراوە.

دەزگای چاپ و پەخشی نارین

هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
Website: www.nareenpub.com
E-mail: nareenpub@gmail.com
مۆبایل: ٠٠٩٦٤٧٧٣٤٠٦١٠١٠

# القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى

## به پرسیار و وەڵام


دانراوی

شێخ محمد صالح العثيمين

وەرگێڕانی

د. إحسان برهان الدين


لەگەڵ پاشکۆیەکی پێناسەکردن بۆ فیرقەو تاقمەکان


دەزگای چاپ و پەخشی

نارین

# پێشه‌كی

كتێبی (القواعد المثلی فی صفات الله وأسمائه الحسنی) كتێبێكی گرنگ و به‌سووده ده‌رباره‌ی به‌شێكی گرنگی عه‌قیده وبیروباوه‌ڕی موسوڵمان، ئه‌ویش ناوو سیفه‌ته‌كانی الله یه، هۆكاری هه‌ڵبژاردنی كتێبه‌كه بۆ ئه‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه كه له‌سه‌ر مه‌نهه‌جی پێشینان وئه‌هلی سوننه‌ت و به‌به‌ڵگه‌ی قورئان و فه‌رمووده نووسراوه، هه‌روه‌ها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بابه‌ته‌كانی به شێوه‌یه‌كی ڕوون وئاسان خراونه‌ته‌ڕوو ، هه‌ندێك له‌وانه‌ی ویستوویانه خزمه‌تی كتێبه‌كه بكه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی به ئاسانی بگاته فێرخوازانی زانست، كردوویانه‌ته شێوازی پرسیارو وه‌ڵام، منیش به‌پێویستم زانی وه‌ریبگێڕمه سه‌ر زمانی كوردی ، له بابه‌ته زانستی و سه‌ره‌كی كتێبه‌كه به‌ته‌واوی وابه‌سته‌ی ناوه‌ڕۆكی كتێبه‌كه بوومه، به‌ڵام له بازنه‌یه‌كی سنووردار‌دا ئه‌وه‌شی به باشم زانیبێت و له توانامدا بووێت له ڕوونكردنه‌وه‌و بۆ زیاد كردن بۆ خوێنه‌ری كورد له په‌رتوكه‌كه‌دا ئه‌نجامم داوه، وه‌كو ئه‌وه‌ی پێناسه‌یه‌كی تاقمه لاده‌ره‌كانم كردووه كه له ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت جیابوونه‌ته‌وه.

شایانی باسه كه ئه‌م كتێبه بریتییه له‌و باسه زانستییانه‌ی له كتێبی ئاماژه بۆ كراودا هاتووه ده‌رباره‌ی ناوو سیفه‌ته‌كانی الله عزوجل كه ده‌گونجێت به شێوه‌ی پرسیار و وه‌ڵام بخرێته‌روو، واته به‌شی كۆتایی كتێبه‌كه‌ی تێدا نییه كه دانه‌ره‌كه‌ی هه‌ندێ نموونه‌ی هێناوه‌ته‌وه له‌وانه‌ی كه وه‌كو ڕه‌خنه ئاڕاسته‌ی ئه‌هلی سوننه‌ت ده‌كرێت كه گوایه ئه‌وانیش له چه‌ند جێگه‌یه‌كدا ده‌قه‌كانیان ته‌ئویل كردووه‌و له زاهیری دووریان خستووه‌ته‌وه، چونكه ئه‌و به‌شه ناگونجێت وه‌كو پرسیار وه‌لام ڕێكبخرێت و به‌شێكیش نییه له بابه‌تی ناونیشانی كتێبه‌كه كه بریتییه له كۆمه‌ڵه

بنچينه‌يه‌كى به‌سوود سه‌باره‌ت به شێوازى زانستى وشه‌رعى مامه‌ڵه كردن له گه‌ڵ مه‌سه‌له‌ى (الأسماء والصفات) دا.

هه‌ندێك ڕه‌خنه‌م لێ ده‌گرن كه بۆچى كتێبى شێخ (محمد صالح العثيمين) م هه‌ڵبژاردووه و كتێبێكى زانا گه‌وره‌كانى پێشينانم هه‌ڵنه‌بژاردووه بۆ ئه‌وه‌ى كارى له‌سه‌ر بكه‌م و پێشكه‌شى خوێنه‌رى كوردى بكه‌م، هه‌روه‌ها ڕه‌خنه‌ى ئه‌وه‌شم لێ ده‌گيرێت كه ئه‌و زانايه سه‌باره‌ت به مه‌سه‌له‌ى هه‌ڵوێستى له وه‌لى ئه‌مر و كۆمه‌ڵێك پرسى ترى عه‌قيده كه هه‌ڵه‌ى هه‌بووه، ده‌بوو من نه‌گه‌ڕێمه‌وه بۆ كتێبى ئه‌و، وه‌لاميشم له‌و باره‌وه به كورتى ئه‌وه‌يه:

له ڕاستيدا هه‌ڵبژاردنم بۆ ئه‌م كتێبه‌ى شێخ ابن عثيمين له‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێت كه كتێبێكى ئاسانه و له‌سه‌ر بنه‌ماى كتێبه‌كانى زانايانى سه‌له‌ف نووسيوێتى وناوه‌ڕۆكه‌كه‌ى به‌راورد به زۆر كتێبى تر ئاسان و ڕوون و پوخته، سه‌باره‌ت به هه‌ندێك له فه‌تواو و هه‌لوێسته‌كانى ئه‌م زانايه له مه‌سه‌له‌ى وه‌لى ئه‌مرو هه‌ڵبژاردن و هه‌ندێ بابه‌تى تر، من هيچ كات نه ئه‌و ونه‌غه‌يرى ئه‌وم له زانايان به معصوم نه‌زانيوه و پشتگيريش له هيچ هه‌ڵه‌يه‌كى ئه‌م زانايه و هيچ زانايه‌كى تر ناكه‌م و ئه‌گه‌ر بۆشم ڕاست بيته‌وه له قسه‌و فه‌توايه‌كيدا نه‌يپێكاوه لێى وه‌رناگرم، به‌ڵام باوه‌ڕم وايه له زانا به تواناكانى وه‌كو ئه‌م زانايه ده‌كرێت چاكه‌كانيان و ئه‌وه‌ى موافيقى كيتاب و سوننه‌ته – كه زۆرن - لێيان وه‌ربگيرێت و ئه‌وه‌ش ناكۆكه له گه‌ڵ ئه‌و دوو سه‌رچاوه‌يه و وه‌كو مرۆڤێك ڕاستييان نه‌پێكاوه هه‌ڵه‌كه‌يان به‌رێزه‌وه ڕه‌تبكرێته‌وه و ئێمه بنه‌ماى ڕوون و ئاشكراى قورئان و سوننه‌تمان له‌به‌رده‌ستدايه و هه‌موو شتێك له ڕۆشنايى ئه‌و دوو سه‌رچاوه‌يه‌دا وه‌رده‌گرين يان ڕه‌تى ده‌كه‌ينه‌وه، جگه له‌وه‌ش بنه‌مايه‌كى گشتى هه‌يه له ئيسلامدا كه بريتييه له‌وه‌ى قسه‌ى زانايان خۆى بۆ خۆى به‌ڵگه نييه، به‌ڵكو پێويستى به‌به‌ڵگه‌ى كيتاب و سوننه‌ته بۆ ئه‌وه‌ى

شەرعیەت وەربگرێت وئەو زانایەش جگە لەو چەند مەسەلەی ئاماژەی پێدەکرێت هەموو بەرهەمەکانی لە درێژایی ژیانیدا جەخت لەسەر عەقیدەی ڕاست و دەست گرتن بە کیتاب و سوننەتەوە دەکەن.

داواکارم لە الله عزوجل ئەم کارەم بە خزمەتی دینەکەی وبە بەشێك لە بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی بۆ بژمێرێت و دانەر و ئامادەکار و بڵاوکار و خوێنەری ئەم بەرهەمە لە پاداشت و لوتف و بەزەیی خۆی بێ بەش نەکات. بڵاوکردنەوی عەقیدەی ڕاست ودرووستی تەوحید

وصلى الله وسلم وبارك على محمد على آله و صحبه و سلم تسليما كثيرا.

د.إحسان برهان الدين

٢٢ ذو القعدة ١٤٤٤/ ١١ حزيران ٢٠٢٣

سلێمانی/ گرین سیتی

# بەشی یەکەم

# پرسیارەکان دەربارەی بنچینەی یەکەم

**پرسیاری ١** : کامەیە یەکەمین ئەو بنەمایانەی پێویستن بزانرێن سەبارەت بە ناو وسیفەتەکانی الله تعالی کە لە کتێبی (القواعد المثلی فی صفات الله وأسمائه الحسنی) دا هاتووە؟

**وەڵام/** ناوەکانی الله تعالی هەموویان جوانن و بە (الحسنی) وەسف و ستایش کراون، زانایان ئەمەیان بەیەکەمین بنەما داناوە سەبارەت بە ناوەکانی پەروەردگار، ابن تیمیة و ابن قیم لە چەندین جێگەی کتێبەکانیاندا ئاماژەیان بەم بنەمایە کردووە.

**پرسیاری ٢:** بەڵگە چییە لە قورئانی پیرۆزدا کە ئەو ناوانە جوانن؟

**وەڵام/** بەڵگە ئەوەیە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا﴾ واتە: الله تعالی ناوی جوانی هەیە کە ئاماژە بۆ بێ عەیبی وبێ خەوشی و مەزنیی ئەو دەکات، هەموو ناوەکانیشی هەر بەو شێوە جوانن، بۆیە هەرچی داوایەکتان هەیە لێی، بەو ناوانە داوای بکەن.

**پرسیاری ٣:** واتای چی دەگەیەنێت کە ناوەکانی الله تعالی هەمووی جوانە و لەئەوپەڕی جوانیدان؟

**وه‌ڵام/** واتای ئه‌وه‌یه که ئه‌و ناوانه هه‌ندێ سیفه‌تیان له خۆ گرتووه که به هیچ شێوه‌یه‌ك - وه‌کو ئه‌گه‌ریش - هیچ جۆره که‌م و کورتی و عه‌یبێکیان تێدا نییه. بۆ نموونه: ناوی (الحي) ژیانێکی ته‌واو ده‌گرێته‌وه که نه‌بوونی له پێشه‌وه نه‌بووه و نه‌مانیشی به‌دوادا نایه‌ت. یان ناوی (العلیم) زانایه‌که که نه‌زانینێك پێش زانابیه‌که‌ی نه‌بووه‌و بیرچوونه‌وه‌شی هه‌رگیز تووش نابێت.

**پرسیاری ٤:** شێوه‌و چۆنیتی ئه‌و جوانییه چۆنه که له‌ناوه‌کانی الله تعالی دا هه‌یه؟

**وه‌ڵام/** به‌وه‌ی که له هه‌مو ناوێك له‌و ناوانه‌دا به شێوه‌یه‌کی سه‌ربه‌خۆ له جوانی بوونی هه‌یه.

**پرسیاری ٥:** ئایا ده‌گونجێت جوانی ناوێك زیاد بکرێت بۆ جوانی ناوێکی تر؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵێ، جوانی ناوێك ده‌چێته پاڵ جوانی ناوێکی تر، جا له کۆی جوانی و ڕێکوپێکی هه‌ردوو ناوه‌که جوانییه‌کی تری لێ درووست ده‌بێت، له‌و جۆره جوانیه‌ش زۆره له قورئاندا. بۆ نموونه پێکه‌وه بوونی هه‌ردوو ناوی (العزیز) و (الحکیم) ئه‌وه‌ی لی وه‌رده‌گیرێت که عیززه‌ت واته هێزو توانا و ده‌سه‌ڵاتی الله تعالی، له‌گه‌ڵ حیکمه‌ت و داناییدایه.

# پرسیارەکانی بنچینەی دووەم

**پرسیاری ١/** بنچینەی دووەم چییە سەبارەت بە ناوەکانی الله جل جلالە؟

**وەڵام:** بنچینەی دووەم سەبارەت بە ناوەکانی اللە تعالی کە پێویستە بیزانین ئەوەیە: ( أسماء اللە أعلام و أوصاف) واتە: ناوەکانی پەروەردگارمان (أعلام) ە، ئەعلام کۆی عەلەمە، واتە ناوەکە ئاماژە بۆ خاوەنەکەی دەکات. ئەوسافیش کۆی وەسفە، واتە: وەسف و باس کردن و ستایشکردن.

**پرسیار ٢/** بەچی ئیعتیبار و واتایەك ناوەکانی الله تعالى دەبنە (أعلام) و دەبنە (أوصاف) ؟

**وەڵام/** بەو ئیعتیبار و واتایەی کە (عَلَم) ن، و ئاماژە بۆ زاتی اللە دەکەن، لە هەمان کاتدا (وصف) یشن، واتە هەم وەسف و باسکردنیشن بۆ اللە، بۆ نموونە: ناوی (السمیع) ئاماژەیە بۆ زاتی اللە تعالی، بەم ئیعتیبارە عەلەمە و ناوە بۆ ئەو زاتە، بەو پێیەش کە وشەی (السمع) سیفەتی بیستن لە خۆ دەگرێت و اللە تعالی بیسەرە، دەبێتە سیفەت بۆ الله تعالى. بۆیە دەوترێت ناوەکانی اللە هەم عەلەمن، واتە ئاماژە بۆ زاتی الله دەکەن، هەم وەسف و ستایشن بۆی.

مەسەلەی ئەوەی کە ناو ئەعلام و ئەوساف بێت تایبەتە بە اللە و بە پێغەمبەرەکەی صلى الله علیه و سلم، چونکە دەگونجێت کەسێك ناوی عبداللە بێت و خۆی لە ڕاستیدا کەسێکی زۆر بێ باوەڕ و خراپ بێت، یان ناوی (علي) بێت و خۆی پێچەوانەی ناوەکەی بێت وکەسێکی نەفس نزم بێت. مەرج نییە مرۆڤەکان هەمیشە واتای ناوەکانیان گونجاو بێت لەگەڵ سیفەتی خۆیاندا.

**پرسیاری ٣/** چۆن و بەچ شێوەیەك ناوەكانی الله تعالی (مترادف) و هاوواتا دەبن؟

**وەڵام /** ناوەكانی الله تعالی هاوواتا دەبن بەو پێیەی كە هەموویان ئاماژە بۆ یەك زاتێك دەكەن كە ئەویش الله یە.

**پرسیار ٤/** چۆن ناوەكانی الله تعالی جیاواز دەبن؟

**وەڵام/** ناوەكانی الله عزوجل جیاواز دەبن بەو پێیەی كە هەر ناوێك ئاماژە بۆ واتاو مەعنایەكی تایبەت بە ناوەكە خۆی دەكات.

**پرسیاری ٥/** بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی ناوەكانی الله تعالی (أعلام) و(أوصاف) ن ؟

**وەڵام/** بەڵگە لەسەر ئەوە فەرموودەی الله یە لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ یونس:١٠٧ هەروەها ئایەتی:﴿ وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ الكهف: ٥٨. ئایەتی دووەم ئاماژەیە بۆ ئەوەی (الرحیم) لە ئایەتی یەكەمدا سیفەتی ڕەحمەت و بەزەیی لە خۆ گرتووە.

**پرسیار ٦/** بیروباوەڕ و عەقیدەی تاقمی موعتەزیلە دەربارەی ناو و سیفەتەكانی الله عزوجل چییە و چۆنە؟

**وەڵام/** عەقیدەی موعتەزیلە لەم بارەوە ئەوەیە ناوەكانی الله تعالی جێگیر دەكەن و باوەڕیان بە هەموویەتی، بەڵام سیفەتی ناوەكان جێگیر ناكەن و نكۆڵی لێ دەكەن!

**پرسیار ٧/** بۆچی موعتەزیلە ناوەکان جێگیر دەکەن و باوەڕیان پێیەتی، بەڵام نکۆڵی لە سیفەتەکانی دەکەن؟

**وەڵام/** چونکە ئەوان دەڵێن: ئەگەر سیفەتەکان جێگیر بکەین و باوەڕمان پێیان هەبێت ئەو مەسەلە سەر لە (تعدد القدماء)وە دەردەکات، واتە: هەر سیفەتێك لە سیفەتەکانی الله لەوکاتەدا دەبێتە زاتێکی جیاواز کە سەرەتایان نییە، ئەمەش فرەزاتی لێ دەکەوێتەوە! کە ئەمەش بیرۆکە و باوەڕێکی سەیرو ناشەرعی و نالۆژیکییە لە ئەوانەوە.

**پرسیار ٨/** بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی ئەم بیروباوەڕەی موعتەزیلە سەبارەت بەناووسیفەتەکانی الله تعالى هەڵەیە و پووچەڵە؟

**وەڵام/** بەڵگە فەرموودەی پەروەردگارمانە لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ. إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ البروج: ١٢ – ١٦ واتە: لەم ئایەتەدا وەکو ئاشکرایە چەندین وەسف و ستایش بۆ الله هاتووە، لە کاتێکدا الله یەکە و (الواحد الأحد ) ە، ئەو فرە زاتیەش کە ئەوان باسی دەکەن درووست نابێت .

**پرســيار ٩/** بەڵــگەی عەقڵــی چیــیە لەســەر پــووچەڵی ئەو بیروبۆچــوونەی موعتەزیلە؟

**وەڵام/** بەڵگە ئەوەیە ستایش و سیفەتەکان جیاواز نـین لە وەسـفکراوەکان تـاکو بوترێـت دەبـنە چەنـدین ستایشـکراو! بەڵکـو ئەو وەسـف و ستایشـانە هەمـووی تـایبەتن بە وەسـفکراوەکەوە و هەمـوو بـوونەوەرێکیش دەبێـت چەنـد سـیفەتێکی هەبێت.

بۆ نموونە و(للـه المثـل الأعلـى) ئەگەر بوترێـت کەسـێك ئـازایە و ڕاسـتگۆیە و باڵابەرزە و گەنم ڕەنگە، ئەمە مەعنای ئەوە نییە باسـی چـوار کەس و چـوار زاتـت کردووە! بەڵکو باسی یەك کەس کراوە بەڵام ئەو سیفەتانەی هەمووی هەیە.

**پرسیار ١٠/** ئایا وشەی (الدهر) ناوێکە لە ناوەکانی الله تعالى؟

**وەڵام/** نەخێر (الدهر) ناوێك نییە لە ناوەکانی الله تعـالى، چـونکە واتـایەکی لە خۆ نەگرتووە تاکو ببێتە یەکێك لەناوەکانی الله، هەروەهـا لەبەر ئەوەی کە (الـدهر) ناوێکە بـۆ واتـای کـات و زەمـان، اللـه سـەبارەت بەوانەی کە نکۆڵییـان لە ڕۆژی زیندووبوونەوە کردووە فەرموویەتی: ﴿ وَقَـالُواْ مَـا هِيَ إِلاّ حَيَاتُنَـا الدّنْيَـا نَمُـوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلاّ الدّهْرُ﴾ واتە: موشریـك وبتپەرسـتەکان دەیـانوت جـگە لەم ژیانەی دونیا کە تێیدا دەژین و دەمرین هیچ ژیـانێکی تـر نیـیە، ئەوەشـی کە ئـێمە لەناو دەبات تێپەڕبوونی ڕۆژگار و درێژیی تەمەنمانە.

سـەبارەت بەو فەرمـوودەش کە پێغەمـبەر صـلى اللـە عليـە سـلم فەرمـوويەتی: (يؤذيني ابن آدم يسب الدهر وأنا الدهر بيدي الأمر أقلب الليل والنهار)[1] کە اللـە تعـالى لەم فەرمـوود قودسـيەدا نـاوی خـۆی بە (الـدهر) بـردووە، بە کۆتـايی فەرمودەکە تەفسير کراوە کە فەرموويەتی: بيدي الأمر أقلـب الليـل والنهـار) واتە فەرمان و هەموو شتێك بەدەستی خۆمە، ڕۆژگار و شەوگار دەسوڕێنمەوە. الله خۆی زەمانەو ڕۆژگاری درووست کردووە ئيـتر چـۆن دەبێـت سـوڕێنەری ڕۆژگـار هەر خۆی سوڕێندراوەکە بێت؟

**تێبينی/** هەموو ناوێك لە ناوەکانی اللـە تعـالی سـيفەتێکی لە خـۆ گرتـووە، بەڵام مەرج نييە هەمو سيفەتێك ناويش بێت، وەکو هەندێ لەوانەی بە (الصفات الذاتية) دەناسرێت وەکو (اليد) و (العين) ئەمانە ناويان لێ ناتاشرێت!

بەڵام بۆ نموونە (الرحمن) ناو و وەسفی الله يە و هيچ تێکگيرانێك لە نێوانياندا نييە، ناوەکان ئاماژە بۆ زاتـی اللـە دەکەن و هەروەهـا بـۆ سـيفەتی تەواويـی و بـێ عەيبی بۆ الله، بەڵام سيفەتەکان تەنها ئاماژە بۆ واتايەك دەکەن لە زاتی الله دا.

(١) البخاري (٧٤٩١)، ومسلم (٢٢٤٦)<

# پرسياره‌كانی بنچينه‌ی سێيه‌م

**پرسياری ١/** سێيه‌م بنچينه چيه سه‌باره‌ت به‌ناوه‌كانی الله عزوجل كه پێويسته بيزانين؟

**وه‌ڵام/** ناوه‌كانی الله تعالى كاتێك ئاماژه بۆ وه‌سفێكی (متعدي) ده‌كه‌ن - متعدي ، واته: فيعله‌كه بۆ ئه‌وه‌ی واتا ببه‌خشێت ده‌بێت بگات به (مفعول به) ، بۆ نموونه: بَريتُ القلمَ- له‌و حاڵه‌ته‌دا ، ناوی الله له‌و جۆره حاڵه‌تانه‌دا سێ مه‌سه‌له له خۆيان ده‌گرن.

**پرسياری ٢/** ئه‌و سێ مه‌سه‌لانه چين و هه‌ريه‌كه‌و به نموونه‌يه‌ك ئه‌گه‌ر ڕوون بكرێته‌وه؟

**وه‌ڵام/** ئه‌و سێ مه‌سه‌له بريتين له:

١- جێگير بوونی ناوه‌كه بۆ الله تعالى وه‌كو ناوی (السميع) كه ئه‌وه‌ی له خۆگرتووه (السميع) ناوێكه له ناوه‌كانی الله تعالى. وه‌كو فه‌رموويه‌تی: (وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا). واته: الله تعالى ئه‌و ئاخاوتن و پێداچوونه‌وه‌ی ئێوه ده‌بيسێت.

٢- جێگير بوونی ئه‌و سيفه‌ته‌ی كه ناوی ( السميع )ی له خۆی گرتووه، كه بريتييه له سيفه‌تی بيستن. يان بۆ نموونه هه‌ركێ باوه‌ڕی به‌وه هێنا كه الله تعالى (عليم) ه، به‌ڵام باوه‌ڕی به سيفه‌تی عيلم نه‌هێنا، ئه‌وه وه‌كو ئه‌وه‌يه باوه‌ڕی به ناوی (العليم) نه‌هێنابێت، چونكه باوه‌ڕی كه‌س به‌هيچ ناوێكی الله ته‌واو نابێت، تاكو باوه‌ڕی به سيفه‌تی ناوه‌كه‌ش نه‌بێت.

٣- جێگیربوونی حوکم و پێویستییه‌که‌ی، که بریتییه له‌وه‌ی الله بیسه‌ری هه‌موو نهێنی و چپه‌یه‌که، الله تعالى فه‌رموویه‌تی: ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ المجادلة: ١. واته: الله گوێبیستی گفتوگۆی نێوان پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه و سلم و (خولة بنت ثعلبة ) بوو سه‌باره‌ت به (أوس بن الصامت) ی مێردی. الله بیسه‌ره بۆ هه‌موو وته‌یه‌ك، بینه‌ره بۆ هه‌موو شتێك. یان بۆ نموونه ناوی عه‌لیم ئه‌وه ده‌خوازێت باوه‌ڕمان به‌و حوكمانه هه‌بێت كه له‌و ناوه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێت.

بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی زیاتر، الله تعالى له قورئاندا فه‌رموویه‌تی: (إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ ۖ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) المائدة/٣٤. واته ئه‌و ڕێگرو شه‌ڕكه‌رانه‌ی كه ته‌وبه ده‌كه‌ن و له كاره‌كانیان په‌شیمان ده‌بنه‌وه، به‌ر له‌وه‌ی به‌سه‌ریاندا زاڵ بن و ده‌ستگیریان بكه‌ن، ئه‌وه بزانن ئیماندااران كه الله (غفور) ە له به‌نه‌كانی خۆش ده‌بێت، (رحيم)ه، به‌زه‌یی پێیاندا دێته‌وه، واته: ئه‌و دوو ناوه‌ی كه له كۆتایی ئایه‌ته‌كه‌وه هاتووه، حوكمی ئه‌وه‌یان لێ وه‌رده‌گیردرێت، كه ئه‌و ڕێگرو خراپه‌كارانه سزای حه‌دیان له‌سه‌ره، له‌م حاڵه‌ته‌دا له‌سه‌ریان لاده‌چێت.

**پرسیاری ٣/** ناوه‌كانی الله تعالى كاتێك ئاماژه بۆ وه‌سفێكی (متعدي) نه‌كه‌ن و له خۆیاندا واتا ببه‌خشن و واتایان دیار بێت، بۆ نموونه ناوی (الحي)، دوو مه‌سه‌له له خۆ ده‌گرێت، به نموونه‌وه ئه‌و دوو مه‌سه‌له چین؟

**وه‌ڵام/** ئه‌و دو مه‌سه‌له بریتین له:

یه‌كه‌م: جێگیربوونی ئه‌و ناوه بۆ الله تعالى، وه‌كو ناوی (الحي) یان (العظيم) و(الجليل) كه ناوێكن له ناوه‌كانی الله تعالى.

دووەم: جێگیربوونی ئەو سیفەتاتەی کە ئەو ناوانە لە خۆیان گرتووە بۆ الله، کەبۆ نموونە: (الحیاة) واتە: ژیان سیفەتێکە لە سیفەتەکانی الله عزوجل.

---

**تێبینی/** لە زمانی عەرەبیدا، کردار بە پێی واتاکەی دەبێتە دووبەشەوە:

(متعدي) واتە: فیعلەکە لە فاعیلەکە تێدەپەڕێت و دەگاتە (مفعول بە)، بۆنموونە: (فتح طارق الأندلس).(لازم) کردارەکە لە بکەرەکە تێناپەرێت، بۆ نموونە: (سافر خالد). ئەوەش لە زمانی کوردیدا لە بابەتی تێپەڕ و تێنەپەڕ و بەرکاردا باس کراوە.

# پرسیارەکانی بنچینەی چوارەم

**پرسیار ١/** چوارەم بنەما چییە لە بنەماکانی تێگەیشتن لە ناوەکانی الله تعالى؟

**وەڵام/** ئەو بنەمایە بریتییە لە: (دلالة أسماء الله تعالى على ذاته وصفاته تكون بالمطابقة وبالتضمن وبالالتزام. ) واتە: ئاماژەی ناوەکانی الله تعالى لە سەر زات و سیفەتەکانی بە لەیەکچوون و تێهەڵکێشکردن و وابەستەبوونە.

**پرسیار ٢/** واتای ( المطابقة) چییە لەگەڵ باسکردنی نموونەیەکدا؟

**وەڵام/** واتاکەی بریتییە لەوەی وشەکە ئاماژە بۆ واتاکە بکات، بۆ نمونە ناوی (الخالق) واتە بەدیهێنەر، هەم ئاماژەیە بۆ زاتی الله و هەم ئاماژە بۆ سیفەتی خەلق و داهێنان دەکات لەڕێگەی لەیەکچوون و گونجان و وابەستەبوونەوە.

**پرسیاری ٣/** واتای (التضمين) چییە لەگەڵ نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی؟

**وەڵام/** واتاکەی بریتییە لە ئاماژەی وشەکە بۆ بەشێك لەواتاکەی، بۆ نموونە: وشەی (الغفور) تەنها ئاماژە بۆ زاتی الله دەکات، هەروەها ئاماژە بۆ سیفەتی لێخۆش بوون دەکات بەتەنها لە ڕێگەی (تضمين) تێخستن و تێهەڵکێشکردنەوە.

**پرسیار ٤/** واتای (الالتزام) چییە لەگەڵ نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکە؟

**وەڵام/** واتاکەی بریتییە لە ئاماژەی وشەکە بۆ شتێك لە دەرەوەی خۆی، نموونەی ئەوە (الخالق) ە، واتە درووستکار و داهێنەر دەبێت خاوەن توانا و زانست بێت و زیندوو بێت.

**پرسيار ٥/** حوكمی (لازم) و پێویست له كەلامی الله و پێغەمبەرەكەیدا صلى الله عليه و سلم و هۆكارەكەشی چییه؟

**وەڵام/** (لازم) و پێویست ئەوەی له قسەی الله تعالى و پێغەمبەرەكەی صلى الله عليه و سلم سەرچاوە دەگرێت، حەق و پێویستە، چونكە هەموو قسەیەكیان ڕاست و حەقە، ئەوەشی له حەق سەرچاوە بگرێت پێویستە كاری پێ بكرێت و باوەڕمان پێی هەبێت، چونكە الله تعالى زانا بووە بەوەی كە دەبێتە پێویست و له قسەكانی خۆی و پێغەمبەرەكەی صلى الله عليه و سلم وەردەگیردرێت ئەوەش پێویست و داواكراوە. بۆ نموونە ئـایەتی: (فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ) البقرة/ ١٨٧.

به پێی ئەم ئایەتە چوونە لای هاوسەر له خۆرئاوابوونەوە تاكو بانگی بەیانی له مانگی ڕەمەزاندا درووست وڕێگەپێدراوە. لازمی ئەمەش كە دەبێتە پێویست وحوكمێكی شەرعی و وەردەگیرێت ئەوەیە، درووستە دوای بانگی بەیانی واتە لەو كاتەی كە كەسەكە بەڕۆژووە لەشگران بێت وڕۆژووەكەی پی بەتاڵ نابێتەوە.

**پرسیار ٦/** مه‌سه‌له‌ی (لازم) له وته‌ی كه‌سانی جگه له الله و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی صلى الله عليه وسلم دا چۆنه و چه‌ند حاڵه‌تی هه‌یه؟

**وه‌ڵام/** مه‌سه‌له‌ی لازم واته ئه‌و واتایه‌ی كه له وته‌ی كه‌سێكدا به‌ناڕاسته‌وخۆ وه‌رده‌گیرێت، ئه‌ویش سێ حاڵه‌تی هه‌یه:

١- وته وه‌رگیراوه‌كه بدرێته پاڵ خاوه‌نه‌كه‌ی وئه‌ویش وابه‌سته‌ی بێت و نكۆڵی لێ نه‌كات كه وته‌كه‌ی ئه‌وه ده‌گرێته‌وه، له‌و حاڵه‌ته‌دا لازمی قه‌وله‌كه‌ش ده‌بێته قه‌ولێكی تر.

٢- به خاوه‌ن قه‌وله‌كه بوترێت ئه‌مه وته‌ی تۆیه و به‌ناڕاسته‌وخۆ ئه‌و واتایه‌ش ده‌گه‌یه‌نێت، به‌ڵام ئه‌و نكۆڵی لێ بكات و بڵێت نه‌خێر وانییه یان مه‌به‌ستم ئه‌وه نه‌بووه! له‌و حاڵه‌ته‌دا نابێته وته‌و قه‌ولی ئه‌و كه‌سه.

٣- ئه‌وه‌ی كه وه‌كو لازم له وته‌كه وه‌رده‌گیرێت، نه جێگیر بكرێت و نه نكۆڵی لێ بكرێت، واته خاوه‌نی قه‌وله‌كه نه ڕازی بووبێت كه ئه‌وه‌ی له قسه‌كه‌ی وه‌رگیرێت ئه‌ویش قسه‌ی خۆیه‌تی و نه نكۆڵیشی لێ كردبێت، له‌و حاڵه‌ته‌دا لازمی قه‌ول نابێته قه‌ول. به‌واتایه‌كی تر ئه‌و واتایه‌ی له وته‌كه‌ی وه‌رده‌گیرێت نابێته ماڵ به‌سه‌رییه‌وه.

# پرسياره‌كانى بنچينه‌ى پێنجه‌م

**پرسيارى ١/** بنچينه‌ى پێنجه‌م سه‌باره‌ت به‌ ناوه‌كانى الله تعالى چييه‌؟

**وه‌ڵام/** بنچينه‌كه‌ بريتييه‌ له‌: ( أسماء الله تعالى توقيفية لا مجال للعقل فيها) واته‌: ناوه‌كانى الله عزوجل (توقيفية) وته‌نها له‌ ده‌قى قورئان وسوننه‌ته‌وه‌ وه‌رده‌گيرێن و هيچ بوارێك بۆ مرۆڤه‌كان نييه‌ به‌عه‌قڵى خۆيان قسه‌ى تێدا بكه‌ن.

بۆيه‌ له‌م مه‌سه‌له‌دا پێويسته‌ له‌ سنوورى كيتاب و سوننه‌ت ڕابوه‌ستين و هيچ زياد و كه‌مێك له‌مه‌سه‌له‌ى ناوه‌كانى الله تعالى دا ئه‌نجام نه‌ده‌ين، هه‌روه‌كو خۆى فه‌رموويه‌تى: (وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السمع والبصر والفؤاد كُلُّ أولئك كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً ). واته‌: ئه‌ى مرۆڤ شوێنكه‌وتووى هيچ مه‌به‌ كه‌ نايزانيت و به‌ته‌واوى شاره‌زاى نيت، به‌ڵكو دڵنيابه‌ره‌وه‌و وردبه‌ره‌وه‌، چونكه‌ مرۆڤ له‌ چۆنێتى به‌كارهێنانى گوێ و چاو و دڵيدا به‌رپرسياره‌، جا ئه‌گه‌ر له‌ خێرو چاكه‌دا به‌كارى هێنا پاداشتى ده‌ست ده‌كه‌وێت، ئه‌گه‌ر له‌ شه‌ڕ و خراپه‌شدا به‌كارى هێنا سزا ده‌درێت.

**پرسيار ٢/** (توقيفية) واتاى چى ده‌گه‌يه‌نێت؟

**وه‌ڵام/** واته‌ ڕاگيراوه‌ له‌سه‌ر كيتاب و سوننه‌ت و ته‌نها ئه‌و ناوه‌ جێگير ده‌كرێت كه‌ به‌ڵگه‌ى جێگيربوونى له‌و دوو سه‌رچاوه‌دا هاتبێت.

**پرسيار ٣/** ئايا مرۆڤ به عه‌قڵی خۆی ده‌توانێت بزانێت الله تعالى شايانی چ ناوێکه؟

**وه‌ڵام/** عه‌قڵی مرۆڤ توانای ئه‌وه‌ی نییه ناو بۆ الله عزوجل دياری بکات ، ئه‌ويش له‌به‌ر چه‌ند هۆکارێك:

١- ناودانان بۆ الله تعالى کاری مرۆڤه‌کان نییه و ئه‌گه‌ر بيکه‌ن ده‌بێته جۆرێك له درۆ و قسه‌هه‌ڵبه‌ستن" الله عزوجل فه‌رمويه‌تی: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ الأعراف: ٣٣. به پێی کۆتايی ئايه‌ته‌که هه‌ر قسه‌يه‌ك يان ناودانانێك بۆ الله تعالى به‌بێ هه‌بوونی به‌ڵگه‌يه‌ك کارێکی قه‌ده‌غه‌کراوه.

٢- له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دانانی ناوێك بۆ الله که خۆی بۆ خۆی دياری نه‌کردووه، يان نکۆڵی کردن له ناوێك که خۆی بۆ خۆی دياری کردووه ، ئه‌وه سنوور به‌زاندنه و تاوانێکی گه‌وره‌يه.

# چه‌ند تێبینییه‌ك له‌سه‌ر ئه‌م بنچینه‌یه‌:

**یه‌كه‌م/** زانایان یه‌كده‌نگن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ر ناوو سیفه‌تێك ڕیگه‌ی پێ درابێت له‌ كیتاب و سوننه‌تدا درووسته‌ بوترێت ئه‌وه‌ ناوی الله یه‌.

**دووه‌م/** به‌هه‌مان شێوه‌ زانایان یه‌كده‌نگن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ر ناوو سیفه‌تێكی ڕێگه‌ پێنه‌دراو له‌و دوو سه‌رچاوه‌یه‌دا نابێت وه‌كو ناو بۆ الله به‌كار بێت.

**سێیه‌م/** سه‌باره‌ت به‌ناوێك نه‌ ڕێگه‌ پیدراو بێت و نه‌ نكـۆلی له‌سـه‌ر به‌كارهێنـانی كرابێت به‌م شێوه‌ جیاوازییان له‌ نێواندا هه‌بووه‌:

١- مه‌نهه‌جـی ئه‌هلـی سـوننه‌ت وه‌كـو پێشـتر ڕوون كـرایه‌وه‌ بـریتییه‌ له‌وه‌ی ناوه‌كانی الله عزوجل ته‌وقیفییه‌ و هیچ بوارێك نیـیه‌ بـۆ مرۆڤه‌كـان نـاوی بـۆ زیـاد بكه‌ن، ده‌كرێت فه‌رمووده‌ی (لا أُحصي ثناءً علَيكَ أنتَ كما أثنَيتَ علَى نفسِك)[1] كه‌ له‌ سه‌حیحی موسلیمدا هاتووه‌ بكرێته‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌، چونكه‌ ناو دیاری كـردن به‌شێكه‌ له‌ واتای وشه‌ی (ثناء)، واته‌ ستایشكردن و ئه‌و كاره‌ له‌ توانای مرۆڤه‌كاندا نییه‌.

٢- بۆچوونێكی تر هه‌یه‌ له‌ ده‌ره‌وه‌ی ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت بریتییه‌ له‌وه‌ی كه‌ ناوه‌كـانی اللـه‌ تعـالی ته‌وقیفـی و سـنووردار نـین و ده‌كرێـت ودرووسـته‌ هه‌ر ناوێكی شیاو بۆ الله تعالی دابنرێـت، به‌مه‌رجێـك گومـانی عه‌یـب و خه‌وشـی تێـدا نه‌بێت، ئه‌مه‌ بۆچوونی موعته‌زیله‌ و هه‌روه‌ها له‌ ئه‌شـاعیره‌ش البـاقلانی له‌ (تمهیـد الاوائل ٢٦١) و التفتـازاني ش ئه‌وی گواسـتووه‌ته‌وه‌ له‌ (شرح المقاصـد ٣٤٤/٤)

---

(١) صحيح مسلم: (٤٨٦).

الباجورى ش به‌هه‌مان شێوه له ( شرح جـوهرة اللقـاني ٨٩) ئه‌وانه‌ش له‌سـه‌ر ئه‌م بۆچوونه بوونه.

٣- بۆچونێكى تريش هه‌يه كه هه‌ندێ له زانايان ڕاوه‌سـتاون و هـيچ قسـه‌يه‌كيان نه‌كردووه، واته نه‌وتوويانه درووسته ناو زياد بكرێت و نه وتوويانه درووسـت نيـيه. ئه‌م بۆچـوونه له إمـام الحـرمين له (الارشـاد ١٣٦) گێـڕدراوه‌ته‌وه، و الزركشيـ له (شرح جمع الجوامع ٤ / ٨٦٩) له البـاقلاني گێـڕاوێتييه‌وه كه ئه‌ويـش دوو قه‌ولـى بووه له‌م مه‌سه‌له‌دا.

ده‌شـگێڕنه‌وه يه‌كێـك له هۆكاره‌كـانى به‌جێهێشـتنى أبـو الحسـن الأشـعري بـۆ موعته‌زيله‌كـان ئه‌وه بـووه كه جيـاواز له ئه‌وان بـاوه‌ڕى وابـووه هـيچ ناوێـك بـۆ ناوه‌كانى الله تعالى نابێت زياد بكرێت.

# پرسیارەکانی بنچینەی شەشەم

**پرسیار ١/** شەشەم بنچینەی ناوەکانی الله تعالى چییە؟

**وەڵام/** شەشەم بنچینە بریتییە لە: (أسماء الله غير محصورة بعدد معين) واتە: ناوەکانی الله تعالى نەبەستراوەتەوە بە ژمارەیەکی دیاری کراو.

**پرسیار ٢/** بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی ناوەکانی الله تعالى لە ژمارەیەکی دیاریکراودا قەتیس نەبووە؟

**وەڵام/** بەڵگە فەرموودەی پێغەمبەرە صلى الله عليه و سلم: (أسألك بكل اسم هو لك، سميت به ،نفسك أو أنزلته في كتابك، أو علمته أحدًا من خلقك، أو استأثرت به في علم الغيب عندك)[1]. واتە: لێت دەپاڕێمەوەو داوات لێ دەکەم بە هەموو ناوێك کە ناوی تۆیە و پێی ڕازیت ناوت بێت، یان لە قورئانەکەتدا داتبەزاندووە، یان فێری یەکێك لە بەندەکانی خۆت کردووە، یان لە زانستی شاراوەو غەیبدا لەلای خۆت هێشتووتەوە.

---

(١) أخرجه أحمد (٣٧١٢) واللفظ له، وابن حبان (٩٧٢)، والطبراني (١٠/٢١٠) (١٠٣٥٢) باختلاف يسير.

**پرسيار ٣/** ئايا فه‌رمـووده‌ی (إن للـه تسـعة وتسـعين اسـمًا مائـة إلا واحـداً مـن أحصاها دخل الجنة)[1]. ده‌بێته به‌ڵگه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی اللـه تعـالی ته‌نهـا نه‌وه‌د و نـۆ ناوی هه‌يه؟

**وه‌ڵام/** نه‌خێر، له‌به‌ر دوو هۆكار ئه‌و فه‌رمووده‌يه نابێته به‌ڵگه بـۆ قه‌تـيس كردنـی ناوه‌كانی الله تعالی له نه‌وه‌د و نۆ ناودا:

١- ئه‌گه‌ر مه‌به‌ست له فه‌رمووده‌كه سنووردار‌كردن بوايه ده‌بوو به‌م شێوه ده‌سـتی پێ بكردايه: (إن أسماء الله تسعة وتسعون اسمًا...) واته: ناوه‌كانی اللـه تعـالی نه‌وه‌د و نۆ ناون، نه‌ك به‌و شـێوه‌ی كه له فه‌رمـووده‌كه‌دا هـاتووه: اللـه تعـالی نه‌وه‌د و نـۆ ناوی هه‌يه. بۆ نموونه: ئه‌گه‌ر كه‌سێك بڵێت: سه‌د هه‌زار دينارم بـۆ خێـر و سـه‌ده‌قه داناوه، مه‌عنای ئه‌وه نييه ئه‌و كه‌سه هيچ پاره‌يه‌كی تری نييه بـۆ سـه‌ده‌قه ته‌رخـانی بكات، ئه‌وه ته‌نها بۆ روونكردنه‌وه ( وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى).

٢- مه‌به‌ست له‌م فه‌رمووده‌يه ئه‌وه‌يه موسوڵمان ئه‌و نه‌وه‌د و نۆ ناوه له‌به‌ر بكات و باوه‌ڕی پێيان هه‌بێـت و نزايـان پـێ بكـات و په‌روه‌ردگـاری پێيـان سـتايش بكـات ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه، نه‌ك مه‌به‌ست له‌وه بێت جگه له‌و نه‌وه‌د و نۆ نـاوه نـاوی تـری نييه. هه‌ندێ ڕای جياواز و خيلافی زانايان له‌م بـاره‌وه هه‌يه، به‌باشـم نه‌زانـی لێـره هه‌ڵسم به‌شيكردنه‌وه‌يان.

(١)٧٣٩٢ البخاري: (٧٣٩٢) ومسلم: ( ٢٦٧٧).

**پرسيار ٤/** ئايا جێگير بووه له پێغه‌مبه‌ره‌وه صلى الله عليه و سلم ئه‌و نه‌وه‌دو نۆ ناوه‌ی دیاری کردبێت؟

**وه‌ڵام/** نه‌خێر له هيچ فه‌رمووده‌يه‌كی صحيح دا نه‌هاتووه پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه و سلم ئه‌و ناوانه‌ی دیاری کردبێت، ئه‌و فه‌رمووده‌ش كه له‌و باره‌وه هاتووه وه‌كو شيخ الاسلام ابن تيمية فه‌رموويه‌تی فه‌رمووده‌يه‌كی لاوازه‌و صحيح نييه.[١]

**پرسيار ٥/** وشه‌ی (إحصاء) له فه‌رمووده‌كه‌دا (من أحصاها دخل الجنة) مه‌عنای چييه؟

**وه‌ڵام/** ژماردنی به‌وه ده‌بێت كه له واتای وشه‌و ناوه‌ڕۆكه‌كه‌ی تێبگه‌ين و به پێی حوكم و واتاكانيان عيباده‌تی په‌روه‌ردگارمان بكه‌ين. ده‌شكرێت به پوختی واتاكانی وشه‌ی (إحصاء) لێره‌دا بخه‌ينه ڕوو كه بريتين له:

١- به‌واتای له‌به‌ركردنی ئه‌و ناوانه دێت، وه‌كو الخطابي له كتێبی: (شأن الدعاء / ٢٦) وتوويه‌تی: وشه‌كه به‌واتای بژاردن دێت واته له‌به‌ر بكرێن و نزاو پاڕانه‌وه‌يان پێ بكرێت، وه‌كو الله فه‌رموويه‌تی: (وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا) الجن/ ٢٨. هه‌روه‌ها كۆمه‌ڵێك له زانايان وه‌كو القرطبي و البغوي و السنوسي و العيني له‌شه‌رحی سه‌حيحی بوخاريدا له‌سه‌ر ئه‌م بۆچوونه‌ن.

٢- به‌واتای توانين وبه‌رگه گرتن دێت، وه‌كو له ئايه‌ته‌كه‌دا هاتووه: (عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ) المزمل/٢٠. واته: كێ توانی به‌حه‌قی ئه‌و ناوانه هه‌ڵسێت و به پێی واتاكانيان كرده‌وه بكات و خۆی وابه‌سته‌ی واتاكانيان بكات، بۆ نموونه كه ناوی

(١) بڕوانه: (مجموع الفتاوى ٤٢٢/٢٢).

الرزاق ی خوێنده‌وه متمانه‌ی هه‌بێت كه ڕزقی ئه‌و لای الله یه و هه‌روه‌ها ناوه‌كـانی تر به‌هه‌مان شێوه..ئه‌وه واتای (إحصاء) ه.

٣- واتای (إحصاء) زانیاری ته‌واوه به واتا و مه‌عنای ناوه‌كان" وه‌كـو له قسـه‌ی عه‌ره‌بدا هاتووه: (فلان ذو حصاة) واته: فڵانه كه‌س خاوه‌ن عه‌قڵ و ماریفه‌ته.

٤- واتای (أحصاها) له بۆچـوونی هه‌نـدێكی تـر له زانایانـدا واته بیانناسـێت و بیانزانێت، چونكه مه‌گه‌ر كه‌سـێك ئیمانـدار بێـت ئه‌و نـاوانه بناسـێت، ئیمانـداریش ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه.

٥- واتـاكه‌ی بـریتییه له (عـدها معتقـدا) واته: بیانژمێرێـت به ئـیمان و بـاوه‌ڕی ته‌واوه. چونكه كه‌سی ده‌هری دان به‌خالیق و داهێنه‌ر و درووسـتكاردا نانێـت، ئه‌و كه‌سه‌ش كه له‌فه‌لسه‌فه‌دا ڕۆچووبێت، باوه‌ڕی به الله ی خاوه‌ن توانا و قادر نییه.

٦- (أحصاها) به‌لای هه‌ندێكی تر له زانایانه‌وه واته: بیانژمێرێت و مه‌به‌ستی پێی ڕه‌زامه‌ندی الله تعالی بێت.

٧- (أحصاه) به‌لای هه‌ندێكی تره‌وه واته: كردار به‌و ناوانه بكات، بۆ نمـوونه كه ناوی (الحكیم) ی خوێنـده‌وه بزانێـت و مـتمانه‌ی ته‌واوی هه‌بێـت هه‌رچـی كـار و حوكمی الله هه‌یه بێ حیكمه‌ت نییه...بۆچوونه‌كانیش زۆر له‌یه‌كـتره‌وه دوور نـین و هه‌ندێكیان ته‌واوكه‌ری ئه‌وانی ترن.

# پرسیارەکانی بنچینەی حەوتەم

**پرسیار١/** چییە حەوتەمین بنەما لەبنەماکانی ناوەکانی الله تعالی؟

**وەڵام/** (الإلحـاد) واتە: لادان لەوەی کە پێویسـتە بەرانـبەر ئەو نـاوانە ئەنجـام بدرێت، ئەویش دەبێتە چەند جۆرێکەوە.

**پرسیار ٢/** جۆرەکانی لادان و ئیلحاد کردن لەناوەکانی الله تعالی چین؟

**وەڵام/** ئیلحاد کردن لەناوەکانی الله تعالی دا (کە ئەم ئیلحادە واتاکەی جیـاوازە و بەمەعنای نکۆڵی کردن لە وجود وبوونی الله نایەت) دەبێت بە چەند بەشێکەوە:

١- نکـۆڵی کـردن لە ناوێـك لەو نـاوانە، یـان لەو حـوکم و سـیفەتانەی کە دەیگەیەنن. بۆ نموونە جەهمییەکان نکۆڵییان کرد لە ناوو سیفەتەکانی الله تعـالی و لەبەرانبەردا وتیان الله بوونی ڕەهـا (الوجـود المطلـق)ی هەیە، نابێـت ببەسـترێتەوە بەناو و سیفەتەوە!

٢- وابزانرێت ئاماژە بۆ هەندێ سـیفەت دەکـات لە چەشـنی سـیفەتی مـرۆڤ و درووستکراوەکان، چونکە الله تعالی جیاوازە لە درووستکراوەکانی خۆی و هیچـی لە ئەوان ناچێت.

٣- ناونانی الله تعالی بەناوێك کە خـۆی بۆخـۆی دانەنـاوە ودیـاری نەکـردووە. ئەمەش وەرگێڕان ناگرێتەوە بۆ واتای ناوەکانی، چونکە لەو حاڵەتەدا تـۆ واتـاکەی بەزمانێکی تر ڕوون دەکەیتەوە نەك ناوێکی تازەی بۆ دابتاشیت،. بـۆ نمـوونە نـاوی (الأب) کە خاچپەرسـتان بـۆ اللـە دایانتاشـیوە، یـان نـاوی (العلـة الفاعلـة) واتە: هۆکاری کاریگەر لەلایەن فەیلەسوفەکانەوە دانراوەو مەبەستیان پێی الله یە.

**تێبینی:**

پەیوەست بەم بابەتە، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە وشەی (خوا) یان (خودا) وا دەرناکەوێت تەرجەمەو وەرگێڕانی هیچ ناوێك بێت لە ناوەکانی اللە تعالی، ئەگەرچی وا گومان دەبرێت تەرجەمەی اللە بێت، بەڵکو ناوێکی سەرچاوە نادیارە کە کورد بۆ اللە ی بەکاردەهێنین، هیچ بەڵگەیەکی زانستی و زمانەوانی لەسەر ئەوە نییە کە وەرگێڕانی وشەی اللە بێت و لە ڕاستیدا بنچینە و چاوگی وشەی خوا یان خودا ئەگەر بە پێوەرێکی زانستی وزمانەوانی مامەڵەی لەگەڵ بکەین دەبینین وشەیەکی تەومژاوییە و بنچینەکەی نادیارە و کوردی نییە وەرەنگە فارسیش نەبێت و بەکارهێنانی هەر لەسەرەتاوە پێ دەچێت هەڵەیەکی بێ مەبەست و ڕەنگە مەبەستدار و پیلانێك بۆ داڕێژارو بێت و بە نیازێکی خراپەوە لەسەر کورد تێپەڕ کرابێت.

جێگای ئاماژە پێکردنیشە کە چەندین ئایینی دەستکرد لە هیندستان و شوێنی تر هەمان وشەی خودا بۆ مەعبود و پەرستراوەکانیان بەکار دەهێنن، بۆیە هیچ نەبێت لە ڕووی( احتیاط ) و پارێزگاریکردن لە عەقیدەو بیروباوەڕمان باشترە لە وشەی گوماناوی تا بکرێت خۆمان بپارێزین و لە بەکارهێنانی وشەی خوا خۆمان بەدوور بگرین، هیچ نەبێت وەکو هەنگاوێك بۆ ڕاهاتن لە نووسیندا نەمێنیت لە قسەکردندا ماوەیەکی زۆری دەوێت تا واز لە وشەیەك بهێنین لە منداڵییەوە دەیبیسین و دەیڵێین.. ئەمە قەناعەتی خۆمە کە بەڕاستی دەزانم واللە أعلم.

٤- لە واتاکانی تری (الإلحاد) لە ناوەکانی اللە ناوداتاشین و ناودەرهێنانە لە ناوەکانی اللە تعالی بۆ بت و پەرستراوی تر. بۆ نمونە وەرگرتنی ناوی (العزى) لە العزیز و (اللات) لە الإله، لەسەر بۆچوونی ئەوانەی کە ڕایان وابووە.

**پرسیار ٥ /** حوكمی ئیلحاد كردن له‌ناوه‌كانی الله تعالی به‌هه‌موو به‌شه‌كانییه‌وه چین له‌گه‌ڵ باسكردنی هۆكاره‌كه‌ی؟

**وه‌ڵام/** ئیلحاد كردن له ناوه‌كانی الله تعالی به‌هه‌مو شێوه‌كانییه‌وه قه‌ده‌غه‌و حه‌رامه، چونكه الله تعالی خۆی هه‌ڕه‌شه‌ی له‌و كه‌سانه كردووه‌و فه‌رموویه‌تی: ﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ الأعراف: ١٨٠. واته: الله تعالی خاوه‌نی ناوی ته‌واو جوان و ڕازاوه‌یه، كه ئاماژه بۆ گه‌وره‌یی و مه‌زنی خۆی ده‌كه‌ن و هه‌موو ناوه‌كانیشی به‌و چه‌شنه جوانن، ئێوه‌ش ئه‌وه‌ی ده‌تانه‌وێت به‌و ناوانه داوای لێ بكه‌ن، وازیش له‌وانه بهێنن و لێیان به‌دووربن كه گۆڕانكاری له‌ناوه‌كانی الله تعالی ده‌كه‌ن به زیادكردن و لێ كه‌مكردن و شێواندن، وه‌كو ئه‌وه‌ی ئه‌و ناوانه له كه‌سانێك بنرێن كه شایسته‌ی نین، یان وه‌كو ئه‌وه‌ی بتپه‌رسته‌كانی عه‌ره‌ب ناوی په‌رستراوه‌كانیان به‌و ناوانه‌وه ده‌نا، یان مه‌عنایه‌ك بۆ ئه‌و ناوانه دابنرێت به‌ده‌ر له مه‌به‌ستی الله و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی صلى الله عليه و سلم، ئه‌وانه له‌سه‌ر كرده‌وه خراپه‌كانیان له دونیا وه‌كو كوفر كردنیان به الله و ئیلحاد كردن و لادانیان له ناوه‌كانیدا و به‌درۆخستنه‌وه‌ی پێغه‌مه‌مبه‌ره‌كه‌ی صلى الله عليه و سلم پاداشت ده‌درێنه‌وه و له‌سه‌ری سزا ده‌درێن.

## چه‌ند تێبینییه‌ك:

١- توندڕه‌وه‌كانی جه‌همیه و قه‌رامیته و باتنییه‌كان و ئه‌وانه‌ی له‌سه‌ر بۆچوونی ئه‌وانن، نكۆڵی له ناوو سیفه‌تاه‌كانی الله تعالی ده‌كه‌ن و ده‌ڵێن نابێت به‌هیچ ناوو سیفه‌تیك وه‌سف بكرێت و ئه‌و بوونی ڕه‌های هه‌یه، بۆیه ده‌ڵێن نابێت به الله بوترێت (موجود) یان (علیم) یان (قدیر)، هه‌موو ئه‌وانه به وته‌ی مه‌جازی ده‌زانن و جێگیركردنی ناو و سیفه‌ته‌كان به ته‌شبیهو لێچواندن ده‌زانن.

له‌و گومانه‌شیاندا ئه‌هلی سونه‌ت به‌تێروته‌سه‌ل به ئایه‌ت و به فه‌رمووده و به عه‌قڵ وه‌ڵامی ئه‌وانیان داوه‌ته‌وه و حه‌قیان ڕوون كردووه‌ته‌وه.

٢- حوكمی ناونانی مرۆڤ به‌ناوێك له ناوه‌كانی الله تعالی ده‌بێت به دو به‌شه‌وه:

یه‌كه‌م: ئه‌گه‌ر ناوه‌كه ئه‌لیف و لامی پێوه بێت، وه‌كو: (العزیز) و (الحكیم)، به‌م شێوه درووست نییه ، چونكه ئه‌وه ئاماژه‌یه بۆ ئه‌سڵی ناوه‌كه كه تایبه‌ته به الله تعالی خۆیه‌وه و هه‌ر ئه‌و ده‌گرێته‌وه.

دووه‌م: ئه‌گه‌ر مه‌به‌ست له‌ناونانه‌كه واتای سیفه‌ته‌كه بێت، با ئه‌لیفولامیشی پێوه نه‌بێت هه‌ر درووست نییه، چونكه پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه و سلم نازناوی (أبو الحكم)ی گۆڕی و كردی به (أبو شریح) به‌ناوی كوڕی گه‌وره‌ی كه‌سه‌كه‌وه. به‌ڵام ئه‌گه‌ر مه‌به‌ست له‌وه نه‌بوو له‌و حاڵه‌ته‌دا درووسته چونكه هاوه‌ڵ بووه ناوی حكیم بووه. به‌ڵام بۆ هه‌ندێ ناو وه‌كو: (جبار) با ئه‌لیفولامیشی پێوه نه‌بێت هه‌ر نابێت چونكه واتای مه‌زنی و گه‌وره‌یی زۆری تێدایه كه ته‌نها شایسته‌یه به الله. به‌هه‌مان شێوه ناوه‌كانی( الرحمن ، الخالق، القیوم، البارئ، القهار) درووست نییه وه‌كو ناو بۆ مرۆڤه‌كان به‌كار بێت به بێ ئه‌وه‌ی وشه‌ی عه‌بدی له‌گه‌ڵ بێت.

# به‌شی دووه‌هه‌م

# پرسیاره‌كانی بنچینه‌ی یه‌كه‌می سیفاته‌كان

پاش ئه‌وه‌ی له‌ حه‌وت به‌شی ڕابردوودا، به‌ وه‌رگرتن له‌ كتێبی ( القواعد المثلى) ، به‌ شێوه‌ی پرسیارو وه‌ڵام حه‌وت بنچینه‌ی ناوه‌كانی الله تعالى مان خسته‌ڕوو ، له‌ شێوه‌ی پرسیارو وه‌ڵامدا سه‌باره‌ت به‌ سیفه‌ته‌كانی الله تعالى ش، به‌هه‌مان شێوه‌ حه‌وت بنچینه‌ی تر ده‌خه‌ینه‌ ڕوو .

**پرسیاری ١/** سه‌باره‌ت به‌ سیفاته‌كانی الله عزوجل، یه‌كه‌مین بنه‌ما چییه‌ كه‌ پێویسته‌ بیزانین؟

**وه‌ڵام/** سیفاته‌كانی الله تعالى هه‌مووی سیفاتی ته‌واو و بێ عه‌یب و خه‌وشن و له‌ هیچ ڕوویه‌كه‌وه‌ ئه‌و سیفاتانه‌ هیچ نوقسانی و ناته‌واوییه‌كیان تێدا نییه‌. وه‌كو سیفه‌تی: ( الحياه، العلم، القدرة، السمع ، البصر، الرحمة، العزة ، الحكمة، العلو، العظمة) و سیفه‌ته‌كانی تریش.

**پرسیار ٢/** به‌ڵگه‌ چییه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی الله تعالى به‌ ته‌واوترین سیفه‌ت ستایش و وه‌سف كراوه‌؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵگه‌ ئایه‌تی قورئانی پیرۆزه‌ كه‌ الله تعالى فه‌رمویه‌تی: ﴿لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ النحل: ٦٠. (المثل الأعلى) واته‌: سیفه‌ت و ستایشی به‌رزه‌.

**پرسیار ٣/** له ڕووی عه‌قڵییه‌وه به‌ڵگه چییه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و سیفه‌تانه سیفه‌تی به‌رزو بێ عه‌یب و بێ خه‌وشن؟

**وه‌ڵام/** له ڕووی عه‌قڵییه‌وه ده‌کرێت دوو وه‌ڵام بدرێته‌وه:

١- هه‌موو بوونه‌وه‌رێك له ڕاستیدا پێویسته هه‌ندێ سیفه‌تی هه‌بێت كه پێی بناسرێته‌وه، ئیتر ئه‌و سیفه‌تانه سیفه‌تی ته‌واوی و بێ عه‌یبی بن، یان سیفه‌تی ناته‌واوی بن، بێگومان الله تعالی پاراوه له‌وه‌ی سیفه‌تی عه‌یبدار و ناته‌واویی هه‌بێت، بۆیه ئه‌وه‌ی شایان و شایسته‌ی الله یه كه خاوه‌ن سیفه‌تی ته‌واو وبه‌رز بێت.

٢- له ڕێگه‌ی هه‌ست و بینینه‌وه ده‌ركه‌وتوه، كه به‌نده‌و دروستكراوه‌كان سیفه‌تی بێ عه‌یبییان تێدایه، سه‌رچاوه‌ی ئه‌و سیفه‌تانه‌ش الله یه، بۆیه به‌خشه‌ری ئه‌و سیفه‌ته ته‌واوانه له پێشتره كه خاوه‌نی سیفاتی به‌رز و بێ عه‌یب بێت.

## تێبینی:

- سه‌باره‌ت به (المثل الأعلى) به پێنج ته‌فسیرو بۆچوونی له‌یه‌كتر نزیك هه‌یه:

١- واتای كلمة الإخلاص ده‌گه‌یه‌نێت: (لا إله إلا الله).

٢- مه‌به‌ست له ته‌وحید و به‌ته‌نها الله په‌رستنه.

٣- مه‌به‌ست له‌و نموونانه‌یه كه الله تعالى بۆ خۆی به‌كاری هێناوه، وه‌كو: (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ).

٤- به‌واتای پاراوتر و چاكتر و جوانتر دێت، كه ئه‌وه‌ش ملكه‌چبوونه بۆی به ته‌وحید و به (لا إله إلا الله)، ئه‌مه‌ش وته‌ی پێشه‌وا ( الطبري )یه.

٥- به واتای سیفه‌تی هه‌ره به‌رز دێت، ئه‌مه‌ش بۆچوونی پێشه‌وا ( ابن القيم) ه.

- سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كه به‌نده‌و درووستكراوه‌كان هه‌ندێ جار سیفه‌تی بێ عه‌یبی و ته‌واوییان هه‌یه، له‌م باره‌وه پێویسته ئه‌وه بزانرێت، وه‌كو دانه‌ر خۆی له‌شه‌رحه‌كه‌ی له‌سه‌ر (العقيدة الواسطية) وتوویه‌تی(٩٨/١) (قیاس) كه لێردا مه‌به‌ست پێی به‌راوركردنه، ده‌بێته سێ به‌شه‌وه:

یه‌كه‌م: قیاس الشمول: واته به‌راودكردنی گشتگیر، بۆ نموونه، كه باسی سیفه‌تی (الحياة) ده‌كرێت، ژیانی الله به ژیانی به‌نده‌كانی به‌راورد ناكرێت، چونكه وه‌كو ناو ئه‌و ناوه ده‌یانگرێته‌وه، به‌ڵام ژیانی الله جیاوازه له ژیانی درووستكراوه‌كانی.

دووه‌م: قیاس التمثيل، واته: به‌راوردكردنی لێچواندن. ئه‌م جۆره‌ش به‌هه‌مان شێوه‌ی جۆری یه‌كه‌م مه‌به‌ست لێی ئه‌وه نییه كه هه‌رچی بۆ داهێنه‌ر جێگیر كرا، هه‌مان ئه‌و سیفه‌تانه وه‌كو ئه‌و بۆ به‌نده‌كانیشی جیگیر بكرێت.

سێیه‌م: قیاس الأولويه، واته: به‌راوردكردنی له پێشتر بوون: واته هه‌موو سیفه‌تێك له سیفه‌ته ته‌واو بێ عه‌یبه‌كانی الله تعالى وه‌كو (السمع والبصر والعلم و القدرة ..)

له به‌نده‌كانيشيدا هه‌يه‌، به‌ڵام ئه‌و سيفه‌تانه به به‌رزتر و به كامڵتر و ته‌واوتر له الله تعالى دا بوونى هه‌يه‌، زانايان فه‌رموويانه ئه‌م جۆره له‌به‌راورد كردن بۆ الله تعالى تعالى به‌كارهاتووه له‌به‌ر ئه‌وه‌ى فه‌رمويه‌تى: (ولله المثل الاعلى).

# پرسیارەکانی بنچینەی دووەمی سیفاتەکان

**پرسیار ١/** دووەمین بنچینە چییە کە پێویستە سەبارەت بە سیفاتەکانی الله تعالی بیزانین؟

**وەڵام/** دووەمین بنچینەی پێویست لەم بارەوە ئەویە کە بابەتی سیفاتەکانی اللە عزوجل لە بابەتی ناوەکانی فراوانترە.

**پرسیار ٢/** هۆکاری چییە کە بابەتی سیفاتەکان لە بابەتی ناوەکانی اللە تعالی فراوانترە؟

**وەڵام/** هۆکارەکەی بۆ دوو مەسەلە دەگەڕێتەوە:

١- لەبەر ئەوەی هەموو ناوێك لە ناوەکانی اللە عزوجل سیفەتێکی لە خۆ گرتووە.

٢- لەبەر ئەوەی هەندێ لە سیفاتەکانی اللە تعالی پەیوەندی بە ئەفعال و کردارەکانییەوە هەیە، کردارەکانی الله تعالی ش کۆتایی نییە، وەکو چۆن وتەکانی بە هەمان شێوە کۆتایی نییە.

**پرسیار ٣/** بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی کردارو گوفتارەکانی اللە تعالی کۆتاییان نییە؟

**وەڵام/** بەڵگە ئەوەیە کە الله خۆی فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ لقمان: ٢٧. واتە: ئەگەر هەموو دارو درەختەکانی سەرزەوی

دابدرێن وه‌كو پێنوس و ده‌ریاكانیش ببه‌ن به‌ مه‌ره‌كه‌ب بۆیان، حه‌وت ده‌ریای تریش به‌ دوایانه‌وه‌ بێت و به‌و پێنوس و مه‌ره‌كاه‌بانه‌ وشه‌كانی الله‌ بنوسرێته‌وه‌، ئه‌و پێنوسانه‌ ده‌شكان و مه‌ره‌كه‌به‌كان ته‌واو ده‌بوون، الله‌ تعالی به‌هێزه‌ له‌ تۆڵه‌سه‌ندن له‌ موشریكان و دانایه‌ له‌ به‌ڕێوه‌بردنی درووستكراوه‌كانیدا. له‌م ئایه‌ته‌دا سیفه‌تی كه‌لام و قسه‌كردنی تێدایه‌ بۆ الله‌ تعالی به‌و شێوه‌ی كه‌ شاییسته‌ی مه‌زنی خۆیه‌تی.

**پرسیار ٤/** هه‌ندێ نموونه‌ بخه‌ره‌ ڕوو سه‌باره‌ت به‌ سیفه‌ته‌كانی الله‌ تعالی، له‌گه‌ڵ به‌ڵگه‌ هێنانه‌وه‌ بۆ هه‌موو نموونه‌یه‌ك.

**وه‌ڵام/**

* سیفه‌تی (المجیئ) واته‌: هاتن. الله‌ تعالی فه‌رموویه‌تی: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ الفجر: ٢٢. واته‌: له‌وكاته‌ی سه‌رزه‌وی هه‌موو تێكده‌شكێت و په‌روه‌ردگارت دێت بۆ یه‌كلاكردنه‌وه‌ی كێشه‌كان له‌ نێوان به‌نده‌و درووستكراوه‌كانیدا.

* سیفه‌تی (النزول) واته‌: دابه‌زین. پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وآله وسلم فه‌رموویه‌تی: (ینزل ربنا إلى السماء الدنيا )[1]. واته‌: په‌روه‌ردگارمان بۆ ئاسمانی دونیا داده‌به‌زێت.

(١) البخاري: ( ٧٤٩٤) ومسلم: ( ٧٥٨).

**پرسـيار ٥/** كه‌واته‌ به‌ پێـی ئه‌و دوو نمـوونه‌: ئايـا بۆمـان هه‌يه‌ به‌ اللـه‌ بڵێـين: (الجائی) واته‌: هاتوو. يان (الآخذ) واته‌: وه‌رگر، يان: (النازل) واته‌: دابه‌زيو؟

**وه‌ڵام/** نه‌خێر وه‌كو ناو درووست نييه‌ ناوی له‌و شێوه‌ له‌ الله تعالی بنه‌ين، به‌ڵام وه‌كـو بـاس كـردن و هه‌واڵـدان درووسـته‌ باسـی بكه‌يـن وبڵێـين اللـه‌ تعـالی ئه‌و سيفه‌تانه‌ی هه‌يه‌ له‌ هاتن و تۆڵه‌سه‌ندن ودابه‌زين و سيفه‌ته‌كانی تر.

ڕوونكـردنه‌وه‌: هه‌نـدێ له‌ مامۆسـتايان كه‌ شـه‌رحی ئه‌م بابه‌ته‌يـان كـردووه‌ بـۆ ڕونكردنه‌وه‌ی زياتر وتوويـانه‌: بـۆ ئه‌وه‌ی جـوان له‌مه‌سـه‌له‌ی فراوانـی سـيفاته‌كان به‌راورد به‌ناوه‌كانی الله تعالی تێبگه‌يت، بازنه‌يه‌كی بچـووك درووسـت بـكه‌ وتێيـدا بنووسه‌ ناوه‌كانی الله، به‌ ده‌وری ئه‌و بازنه‌يه‌دا بازنه‌يه‌كی گه‌وره‌تر درووست بـكه‌ و تێيدا بنووسه‌ سيفاته‌كانی الله، به‌ده‌وری ئه‌و بازنه‌يه‌شدا بانه‌يه‌ك له‌ هه‌ردوو بازنه‌كه‌ گه‌وره‌تر درووست بكه‌و تێيدا بنووسه‌ هه‌واڵه‌كان ده‌رباره‌ی الله تعالی. ئينجا هێڵێك له‌ بازنه‌ بچووكه‌كه‌وه‌ به‌ره‌و بازنه‌ی دووه‌م و سێيه‌م ڕابكێشه‌، بۆ ئه‌وه‌ی تێبگه‌يت، كه‌ ئه‌وه‌ی نـاو بێـت بـۆ اللـه‌ تعـالی له‌ هه‌مـان كاتـدا سـيفه‌ت و هه‌واڵيشـه‌، به‌ڵام پێچه‌وانه‌كه‌ی ڕاست نيـيه‌، واته‌: هـێڵه‌كه‌ يـان سـه‌هه‌مه‌كه‌ نابێـت له‌ سـێيه‌م بـازنه‌ی گه‌وره‌وه‌ بگه‌ڕێته‌وه‌ بۆ دوو بازنه‌ بچووكتره‌كه‌، به‌ واتـايه‌كی تـر، مه‌رج نيـيه‌ هه‌مـوو سـيفه‌تێك نـاوی اللـه‌ ی لـێ ده‌ربكرێـت، هه‌روه‌هـا هه‌واڵ سـيفه‌ت و نـاوی لـێ ده‌رناكرێت. بۆ نموونه‌: ئايه‌تی: ﴿ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ﴾ وشـه‌ی الزارعون هه‌واڵه‌، له‌ بازنه‌ گه‌وره‌كه‌دا دايده‌نێين، واته‌: نه‌ ناوه‌ بۆ الله و نه‌ سـيفه‌ته‌. يان وشه‌ی (الكـلام) ئه‌مه‌ سـيفه‌ته‌، له‌بـازنه‌ی دووه‌مـدا دايـده‌نێين و نابێـت بێينـه‌ خواره‌وه‌ بۆ بازنه‌ بچوكه‌كه‌ و ناوی بۆ الله لێ دابتاشين، چونكه‌ وتمان هـێڵه‌كه‌ يـان سـه‌همه‌كه‌ له‌ بـازنه‌ گه‌وره‌كـانه‌وه‌ نـاگه‌ڕێته‌وه‌ بـۆ بـازنه‌ بچووكه‌كـان، به‌ڵا م نـاوی

(القوي) لەبازنە بچووکەکەدا دادەنرێت بۆیە دەگونجێت ببێتە سیفەت و دەگونجێت وەکو هەوالیش باس بکرێت.



# پرسیاره‌كانی بنچینه‌ی سێیه‌می سیفاته‌كان

**پرسیاری ١/** سێیه‌م بنچینه چییه كه پێویسته سه‌باره‌ت به سیفه‌ته‌كانی الله تعالى بیزانین؟

**وه‌ڵام/** سیفاته‌كانی الله عزوجل ده‌بنه دوو به‌شه‌وه: هه‌ندێكیان پێیان ده‌وترێت: سیفاتی (ثبوتي) ، واته: پێویسته جێگیریان بكه‌ین. هه‌ندێكیشیان پێیان ده‌وترێت: سیفاتی (سلبي)، واته: پێویسته نكوڵی لێ بكه‌ین ودرووست نییه الله تعالى ی پێ وه‌سف و ستایش بكرێت له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ناشایستەیه.

**پرسیاری ٢/** (الصفات الثبوتية) واتا و پێناسه‌ی چییه؟

**وه‌ڵام/** (الصفات الثبوتية) بریتییه له‌و سیفه‌تانه‌ی كه الله تعالى له قورئاندا بۆ خۆی جێگیری كردووه، یان له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی صلى الله عليه و سلم له سوننه‌تدا جێگیر بووه‌و پێویسته ئێمه‌یش وه‌كو خۆیان جێگیریان بكه‌ین و باوه‌ڕیان پێ بهێنین.

**پرسیاری ٣ /** به‌ڵگه چییه له قورئانی پیرۆزدا له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه پێویسته ئه‌و سیفه‌تانه وه‌كو خۆیان له‌سه‌ر حه‌قیقه‌ت جێگیر بكه‌ین، واته: ته‌ئویلیان نه‌كه‌ین و واتاكانیان نه‌گۆڕین؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵگه ئه‌وه‌یه كه الله تعالى فه‌رموویه‌تی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ ۚ وَمَنْ

يَكْفُرْ بِاللّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ النساء: ١٣٦.

- باوه‌ڕ بوون به الله تعالى باوه‌ڕ بوون به سیفه‌ته‌كانی له خۆ ده‌گرێت.

- باوه‌ڕ بوونیش به‌و كتێبابه‌ی كه دایبه‌زاندووه‌ته سه‌ر پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یدا صلی الله علیه وسلم، باوه‌ڕبوونی له‌خۆ گرتووه به‌وه‌ی كه ده‌باره‌ی نێره‌ره‌كه هاتووه كه الله یه.

- له‌به‌ر ئه‌وه‌ش كه محمد صلی الله علیه و سلم، نێردراوی رب العالمین ه، واته: باوه‌ڕهێنان به هه‌موو ئه‌وه‌ی كه ده‌رباره‌ی الله تعالى فه‌رموویه‌تی.

**پرسیاری ٤/** به‌ڵگه‌ی عه‌قڵی چییه له‌سه‌ر جێگیركردنی سیفه‌ته‌كانی الله تعالى؟

**وه‌ڵام/** ئه‌و سیفه‌تانه الله تعالى خۆی بۆ خۆی جێگیری كردووه‌و باسی فه‌رمووه، بۆیه پێویسته به‌و شێوه‌ی كه خۆی جێگیری كردووه ئێمه‌ش باوه‌ڕی پێ بهێنین.

**پرسیار ٥/** مه‌رجه‌كانی وه‌رگرتنی هه‌واڵ (خبر) چییه؟

**وه‌ڵام/** مه‌رجه‌كانی وه‌رگرتنی هه‌واڵ (خبر) بریتین له:

* (العلم) واته: زانست كه پێچه‌وانه‌ی نه‌زانین و جه‌هله.

* (الصدق) واته: ڕاستگۆیی كه پێچوانه‌ی درۆیه.

* (الفصاحة) واته: وته‌ی ڕوون وپاراو، كه به‌پێچه‌وانه‌ی به نه‌توانینی ده‌ربڕین دێت...ئه‌مانه‌ش هه‌ندێك ورده‌كاری و شیكردنه‌وه هه‌ڵده‌گرن ئێره جێگه‌یان نییه.

**پرسیاری ٦/** مەبەست لە (الصفات السلبية) چییە و بەواتای چی دێت؟

**وەڵام/** مەبەست لە (الصفات السلبية) ئەو سیفاتانەیە کە الله تعالی خۆی یان پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە و سلم نکۆڵییان لەوە کردووە سیفەتی اللە بێت. بۆنموونە: مردن، خەوتن، نەزانین، ماندوو بوون، بێ دەسەڵاتی ، لەبیرچوونەوە.

**پرسیار ٧/** ئایا دروستە بە هیچکام لەو سیفاتە سەلبیانە اللە تعالی وەسف بکرێت؟

**وەڵام/** نەخێر درووست نییە، لەبەر ئەوەی ئەو سیفەتانە هەمووی سیفاتی کەموکورتی و عەیب ونوقسانین و ناگونجێن الله یان پێ وەسف بکرێت.

**پرسیار ٨/** ئایا تەنها ئەوەندە بەسە کە ئەو سیفاتە سەلبیانە نکۆڵی لێ بکرێت لە حەقی پەروەردگاردا؟

**وەڵام/** نەخێر تەنها ئەوە بەس نییە، بەڵکو پێویستە پێچەوانەکەشی جێگیر بکەین و باوەڕمان پێی هەبێت، چونکە نکۆڵی کردن تەنها خۆی نیشانەی بێ عەیبی و بێ کەم وکورتی نییە، بەڵکو نیشانەی نەبوون و عەدەمە، نەبوون و عەدەمیش واتە هیچ نییە.

**پرسیار ٩/** بۆچی الله تعالی نابێت بە (النفي المحض) واتە: نکۆڵی کردنی پەتی وەسف بکرێت، هۆکار چییە لە قەدەغەبوونی ئەوە؟

**وەڵام/** لەبەر چەند هۆکارێك:

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی نکۆڵی کردنی پەتی یان ڕەها واتای نەبوون و عەدەمە، ئەوەش هیچ فەزل و چاکەیەکی تێدا نییە، چجای ستایشیش بێت.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی نكۆڵی كردن لە شتێك هەندێ جار بە هۆكای ناشاییستەیی و نەگونجان دێت، بۆ نموونە بوترێت: (الجدار لا يظلم) واتە: دیوار ستەم ناكات! ئەوەش نابێتە هیچ وەسف و ستایشێك بۆ دیوار كە كە ستەم ناكات.

**سێیەم/** لەبەر ئەوەش نكۆڵی كردن هەندێ جاری تر لە واتای بێ توانایی و عەجزەوە دێت كە ئەوەش عەیب و نوقسانییە، هەموو ئەو سیفەتانەش قەدەغەیە بەكارهێنانی لە حەقی الله تعالى دا. بۆ نموونە الله تعالى فەرموویەتی: { وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ } الفرقان/٥٨. واتە: پشت بە الله ببەستە كە نامرێت وهەموو واتاكانی ژیانی تەواو وكامڵی هەیە بەو شێوەی كە شیاوێتی. لێرەدا نكۆڵی كردن لە مردن بەواتای ژیانی تەواو دێت. یان كە الله تعالى فەرموویەتی: { وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا } الكهف/ ٤٩. نكۆڵی كردن لەوەی كە اللە ستەم ناكات بەواتای تەواوی دادگەری دێت.

# پرسیاره‌كانی بنچینه‌ی چواره‌می سیفاته‌كان

**پرسیاری ١/** چواره‌مین ینچینه چییه كه پێویسته سه‌باره‌ت به سیفاته‌كانی الله عزوجل بیزانین؟

**وه‌ڵام/** سیفاته (ثبوتي)یه‌كان، واته ئه‌و سیفاتانه‌ی كه پێویسته جێگیریان بكه‌ین، سیفاتی ستایش و ته‌اویی و بێ عه‌یبین.

**پرسیاری ٢/** ئه‌و سیفاتانه چۆن ده‌بنه سیفاتی ستایش و بێ نوقسانی؟

**وه‌ڵام/** ئه‌و سیفه‌تانه تا زۆرتر بن و ئاماژه‌كانیان هه‌مه‌جۆرتر بێت، مه‌زنی و بێ كه‌موكورتی ستایشكراوه‌كه‌ی زیاتر پێ ده‌ده‌كه‌وێت.

**پرسیار ٣/** ئایا سیفاته (ثبوتي) یه‌كان واته ئه‌وانه كه پێویسته جێگیریان بكه‌ین بۆ الله زۆرترن؟ یان سیفاته (سلبي)یه كان، واته ئه‌و سیفه‌تانه‌ی كه پێویسته نكۆڵی لێ بكه‌ین و الله تعالى ی پێ وه‌سف نه‌كه‌ین؟

**وه‌ڵام/** سیفاته (ثبوتية) كان، زۆر له (سلبية) كان زۆرترن، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی جۆری یه‌كه‌م ئاماژه بۆ مه‌دح و ستایشی الله ده‌كات، به‌ڵام جۆری دووه‌م ته‌نها له هه‌ندێ حاڵه‌تی كه‌م باس كراوه.

**پرسیاری ٤/** ئایا سیفاته (سلبي) نه‌رێنیه‌كان، به ڕه‌هایی باس ده‌كرێن؟

**وه‌ڵام/** سیفاته سه‌لبییه‌كان ته‌نها له هه‌ندێ حاڵه‌تدا باس ه‌كرێن.

**پرسيار ٥/** ئه‌و حاڵه‌تانه چين كه ئه‌و سيفه‌تانه‌يان تێدا باس كراوه؟

**وه‌ڵام/** له چه‌ند حاڵه‌تێكدا باسكراون وه‌كو:

**يه‌كه‌م:** بۆ خستنه‌ڕووى گشتگيرى بێ عه‌يب و خه‌وشى و كه‌مالى الله تعالى بۆ نموونه: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١. واته: هيچ شتێك نييه هاوشێوه‌و هاوتاى الله تعالى بێت له درووستكراوه‌كانى، نه له زاتى و نه له سيفاتى و نه له كرداره‌كانيدا، الله تعالى هيچ شتێكى لێ شاراوه نييه له گوفتارو كردارى به‌نده‌كانى و له‌سه‌ر هه‌مووى پاداشتيان ده‌داته‌وه.

**دووه‌م:** بۆ نكوڵى كردن له‌وه‌ى كه بێ باوه‌ڕان و درۆزنه‌كان ده‌يانوت و بانگه‌شه‌ى ئه‌وه‌يان ده‌كرد كه الله تعالى كوڕى هه‌يه: ﴿أَنْ دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا * وَمَا يَنْبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴾ مريم: ٩١ – ٩٢.

**سێيه‌م:** بۆ لابردنى هه‌ر گومانێك ده‌رباره‌ى توانا و سيفه‌ته ته‌واوو به‌رزه‌كانى: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ ق: ٣٨. واته: ئێمه ئاسمانه‌كان و زه‌وى و ئه‌وه‌ى له نێوانياندا هه‌يه له بوونه‌وه‌رى هه‌مه‌جۆر مان درووست كردووه و له‌و درووستكردنه‌وه‌شدا تووشى هيچ ماندوو بوونێك نه‌بووين، ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌يه‌كى له پێشتره له‌سه‌ر تواناى الله تعالى بۆ زيندوو كردنه‌وه‌ى مردووه‌كان.

---

تێبينى: ئه‌هلى سوننه‌ت به پێچه‌وانه‌ى ئه‌هلى بيده‌ع، له باسى سيفاته (ثبوتي) يه‌كاندا كه پێويسته بۆ الله تعالى جێگيرى بكه‌ين، شيده‌كه‌نه‌وه‌و درێژه‌ى پێ ده‌ده‌ن، به‌ڵام له سيفاته سه‌لبييه‌كاندا، به خێرايى به‌سه‌رباسه‌كاندا تێده‌په‌ڕن و شيناكه‌نه‌وه، بۆ نموونه ئه‌گه‌ر كه‌سێك به سه‌رۆكێك يان سه‌رگه‌وره‌يه‌ك بڵێت:

بەڕێزت نە خزمەتكاری نە غەدر وناپاكی دەكەیت نە خائینی نە گەمژەیت نە داوێـن پیسیت...هتد خەڵكی پێی دەڵێن بەشێوازێكی نەشیاوو ناشاییستە قسەی لەگەڵ ئەو سەرۆك و سەركردەیە كردووە. واتە: تەنها ئەوەنـدە بەسـە پێـی بڵێـت تـۆ لە هەمـوو سیفەت و ئاكارێكی ناشاییستەو ناشیرینەوە دووریت.

# پرسياره‌كانی بنچينه‌ی پێنجه‌می سيفاته‌كان

**پرسيار ١/** پێنجه‌مين بنچينه چييه كه پێويسته سه‌باره‌ت به سيفاته‌كانی الله عزوجل بيزانين؟

**وه‌ڵام/** ئه‌و بنچينه بريتييه له‌وه‌ی: سيفاته (ثبوتي) يه‌كان، واته ئه‌و سيفاتانه‌ی كه پێويسته بۆ الله تعالى جێگيرييان بكه‌ين، ده‌بن به دو به‌شه‌وه: (ذاتي) واته: خۆيی، و (فعلي) واته: كرده‌يی.

**پرسيار ٢/** سيفاته (ذاتي) خۆييه‌كان چين؟

**وه‌ڵام/** سيفاتی (ذاتي) بريتييه له‌و سيفاتانه‌ی كه الله تعالى له ئه‌زه‌له‌وه و هه‌ميشه ئه‌و سيفه‌تانه‌ی هه‌يه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ش ناونراوه (ذاتي) خۆيی چونكه وابه‌سته‌ی په‌روه‌ردگاره و لێی جيانابيته‌وه.

**پرسيار٣/** سيفاته (ذاتي) خۆييه‌كان ده‌بنه چه‌ند به‌شه‌وه؟

**وه‌ڵام/** ده‌ين به دوو به‌شه‌وه: (ذاتية معنوية) واته: خۆيی واتايی، و (ذاتية خبرية) واته: خۆيی هه‌واڵی.

**پرسيار ٤/** واتا و پێناسه‌ی سيفاتی (ذاتية معنوية) چييه؟

**وه‌ڵام/** به‌واتای ئه‌وه ديت ئاماژه بۆ واتاو مه‌عنايه‌ك بكات، وه‌كو (السمع) بيستن، ئه‌وه سيفه‌تێكی خۆيی واتاييه. هه‌روه‌ها ( العلم، القدرة، البصر، العزة، العلو، العظمة).

**پرسیار ٥/** واتا و پێناسەی سیفاتی (ذاتیة خبریة) چییە؟

**وەڵام/** ئەم جۆرە سیفەتانە بۆ ئەوە پێیان وتراوە خەبەری لەبەر ئەوەی لە ڕێگەی دەقەکانەوە پێمان گەیشتووە، ناشتوانین ناوی لاوەکی یان هەر تەعبیرێکی تری هاوشێوەی لێ بنێین لەبەر نا شایستەیی لە ئاستی الله تعالی دا. سیفاتی خەبەری بۆ نموونە وەکو:

- الوجه: (وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ). الرحمن:٢٧.

- اليدين: (وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ ۚ ). المائدة:٦٤.

- العينين: (وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي ) طه : ٣٩.

**پرسیار ٦/** سیفاتە کردەییەکان (الصفات الفعلیة) مەعنای چییە؟

**وەڵام/** سیفاتی فیعلی، هەروەها ( الصفات الطارئة) و (الصفات الاختیاریة) شی پێ دەوترێت، واتای ئەوەیە ئەو سیفەتانە پەیوەندی بە ویست و ئیرادەی پەروەردگارەوە هەیە، بیەوێت دەیکات و نەیەوێت نایکات، وەکو (الإستواء) لەسەر عەرش و وەکو (النزول إلی السماء الدنیا) دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا.

**پرسیار ٧/** ئایا دەگونجێت سیفەتێك (ذاتي فعلي) بێت، واتە سیفەتێکی خۆیی کردەیی بێت.

**وەڵام/** بەڵێ دەگونجێت سیفەتێك خۆیی و کردەیی بێت لەیەك کاتدا بەڵام بە دوو ئیعتیبار، وەکو سیفەتی (الکلام) بە ئیعتیباری ئەسڵ و بنچینەکەی سیفەتێکی زاتی خۆییە، چونکە الله تعالی هەمیشە هەر سیفەتی قسەکردن و کەلامی هەر بووە،

بەڵام بە ئیعتیباری قسـەی دیـاریکراوو تـاکەوە، ئەوە لەسـەر مەشـیئەت و ویسـتی خۆی ڕادەوەسنتێت، کەی بیەوێت و چۆن بیەوێت بەو شێوە قسە دەکات.

## تێبینی:

١- ڕەنگە کەسێك بڵێت ئەم دابەشکردنەی سیفاتەکان بەم شێوە پێویسـتی چیـیە؟ وەڵامیش ئەوەیە کە ئەمە بـۆ بەرەنگـاربوونەوەی ئەهلـی کەلامە بـۆ ئەوەی ڕێـگەی ڕاست و حەقیان بۆ ڕوون بکرێتەوە، واتە بەزمانی خۆیان وەڵام بدرێنەوە. لەلایەکـی تریشـەوە ئەم دابەشـکردنە مەسـەلەیەکی زانسـتی زاراوەیـیە بـۆ ڕوونکـردنەوەو نزیککردنەوەی زانستە لە عەقڵی کەسەکانەوە، زانایـانیش فەرموویـانە (لا مشـاحة في الاصطلاح).

-٢هەمـوو سـیفەتێك پەیوەسـت بێـت بە ویسـت و ئیـرادەی اللـە تعـالی، واتە پەیوەست و پەیوەندیدارە بە حیکمەتی خۆیەوە، جا ئەو حـیکمەتە لەوانەیە ئاشـکرا بیت بۆ مـان و لەوانەشـە ئـێمە نەتـوانین پەی بەو حـیکمەتە بـبەین، بەڵام ئـیمان و باوەڕمان وایە کە الله عزوجل ویستی لەسەر شتێك نابێت بەبێ ئەوەی حیکمەتێکـی تێدا بێت، وەکو خۆی فەرمویەتی: (وَمَـا تَشَـاءُونَ إِلَّا أَن يَشَـاءَ اللَّهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا) الانسان/٣٠.

# پرسيارەكانی بنچينەی شەشەمی سيفاتەكان

**پرسيار ١/** شەشەمين بنچينە چييە كە پێويستە سەبارەت بە سيفاتەكانی اللە تعالی بيزانين؟

**وەڵام/** سەبارەت بە جێگير كردنی سيفاتەكان، پێويستە خۆمان لەدوو مەترسی و نەهی لێكراو بەدووربگرين.

**پرسيار ٢/** ئەو دوو مەترسييە چين كە پێويستە بەدووربين لێی و خۆمانی لێ بپارێزين؟

**وەڵام/** يەكەميان (التمثيل) واتە: لێچواندن، دووەميشيان (التكييف) واتە: چۆنيتی دياری كردن.

**پرسيار ٣/** واتاو چەمكی (التمثيل) لێچواندن چييە؟

**وەڵام/** (التمثيل) واتە: ئەو كەسەی كە سيفەتەكە جێگير دەكات، باوەڕی وابێت، ئەو سيفەتانەی كە بۆ اللە تعالی جێگيری كردووە، وەكو سيفەتی مرۆڤ و درووستكراوەكانە. بۆ نموونە وا بزانێت كە اللە دەستی هەيە، دەستی وەكو دەستی مرۆڤەكانە والعياذ بالله، الله تعالی فەرموويەتی: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشورى/ ١١.

**پرسيار ٤/** بەبەڵگەوە، حوكمی ئەو كەسە چییە كە باوەڕی بەو شێو بێت؟

**وەڵام/** ئەو باوەڕە باوەڕێكی پووچ و بەتاڵە بە بەڵگەی چەندین ئایەت، وەكو: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١، هەروەها فەرموودەی الله تعالى: ﴿أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لَا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ النحل: ١٧، هەورەها ئایەتی: ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا ﴾ مریم: ٦٥.

**پرسيار ٥/** بەڵگەی عەقڵی چییە لەسەر ئەوەی ئەو بیروباوەڕە هەڵەیە و بەتاڵە؟

**وەڵام/** بەڵگەی عەقڵی دەتوانین لە چەند ڕوویەكەوە بخەینە ڕوو:

١- مشتومڕ وناكۆكی هەڵناگرێت كە جیاوازی لە نێوان زات و سیفاتی خالق و درووستكراوەكانیدا هەیە، ئەوەش وا دەكات كە جیاوازی لە سیفەتەكانیشیاندا هەبێت، چونكە هەر یەك لە خالق و مەخلوق سیفاتی شایستە و شیاوی بە خۆی هەیە.

٢- ئایا بەدیهێنەر و خالیقی بێ عەیب و بێ نوقسانی چۆن دەگونجێت سیفاتەكانی هاوشێوەی سیفاتی درووستكراوەكانی خۆی بێت، كە ئەوان هەمیشە نیازیان بە كەسێكە كە نوقسانی وكەم و كورتییان بۆ پڕ بكاتەوە، لێچواندنی پەروەردگاری بێ عەیب و نوقسانی بە مەخلوقی پڕ عەیب و نوقسانی جۆرێكە لە عەیب و خەوش كە الله تعالى لەوە بەرییە.

٣- یەكگرتنەوە لە ناودا واتای ئەوە ناگەیەنێت یەكگرتنەوە لە حەقیقەتیشدا هەبێت، الله ژیان و توانا و زانست و بینین و بیستنی هەیە و مرۆڤەكانیش هەیانە، ئەگەرچی وەكو ناو یەكدەگرنەوە ، بەلام وەكو حەقیقەت زۆر جیاوازن.

**پرسيار ٦/** واتای (التكييف) و شێوه بۆ دياريكردن چييه؟

**وه‌ڵام/** واته ئه‌و كه‌سه‌ی كه سيفه‌تێك بۆ الله جێگير ده‌كات باوه‌ڕی وابێت كه سيفه‌تێكه ئاوها و ئاوهايه بێ ئه‌وه‌ی بيبه‌ستێته‌وه به هاوشێوه‌يه‌ك.

**پرسيار ٧/** به‌ڵگه چييه له‌سه‌ر پووچه‌ڵی بيروباوه‌ڕی (التكييف)؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵگه ئايه‌تی قورئانی پيرۆزه: ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا﴾ طه١١٠ . هه‌روه‌ها ئايه‌تی:﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴾ الإسراء٣٦

بێگومان كه ئێمه ئاگادار نين له چۆنێتی ئه‌و سيفه‌تانه‌ی باوه‌ڕمان پێيه‌تی چونكه الله تعالی خۆی حه‌قيقه‌تی شێوه‌كه‌ی بۆ ده‌رنه‌خستووين، بۆيه هه‌ر دياری كردنێك بۆ شيوازی ئه‌و سيفه‌تانه جۆرێكه له سنوور به‌زاندنی شه‌رعی و قسه كردنی بێ به‌ڵگه.

**پرسيار ٨/** به‌ڵگه‌ی عه‌قڵی چييه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و بيروباڕه به‌تاڵه؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵگه ئه‌وه‌يه كه هيچ شتێك حه‌قيقه‌تی سيفه‌ته‌كانی نازانرێت تاكو:

زانستی ته‌واوت ده‌رباره‌ی زاتی ئه‌و شته يان به‌هاوشان و هاوشێوه‌يه‌كی نه‌بێت، يان هه‌واڵێكی ڕاست و درووست له‌و باره‌وه هه‌بێت. هيچيش له‌م ڕێگايانه سه‌باره‌ت به سيفه‌ته‌كانی الله تعالی به‌رده‌ست نين، بۆيه بيروباوه‌ڕی (التكييف) واته دياری كردنی شێوه‌و چۆنێتی بۆ سيفه‌ته‌كانی الله بيروباوه‌ڕێكی ناڕاست و به‌تاڵه.

**تێبینی:**

- بنەمایەك هەیە دەڵێت: (كل ممثل مكيف وليس كل مكيف ممثلا) واته سەبارەت بە ئەسمائو سیفات، هەرکێ حاڵەتی لێچواندنی تێدا بوو بۆ سیفەتەکانی اللـه تعالی ئەوە (تکییف) و دیاری کردنی شێوەو چۆنێتیشی تێدایە، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاست نییە.

- (تکییف) ئەوەیە باسی چۆنێتی شتەکە بکرێت، ئیتر ئەو چۆنیتییە ڕەها بێت، وەکو ئەوەی بۆ نموونە کەسێك بڵێت: سەیارەیەکم کڕی چۆنێتی و شێوازی ئاوها و ئاوهایە، بێ ئەوەی باسی سەیارەیەکی تری هاوشێوەی بکات! یان بەستراوەتەوە بە شتێکی ترەوە وەکو ئەوەی بڵێت: سەیارەیەکم وەکو ئەم سەیارەیە کڕی.

- پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس بە ڕەحمەت بێت، کاتێك پرسیاری ئەم ئایەتەی لێکرا: {الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى} [طه:٥] ، فەرمووی: ( الاستواء غير مجهول، والكيف غير معقول، والإيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة،) واته: (استواء) و چوونە سەرعەرشەکە لەلایەن الله تعالی نەزانراو نییە، چۆنیتییەکەشی لە توانای عەقڵدا نییە لێی تێبگات، باوەڕ پێ هینانی پێویست و واجیبە، پرسیار کردنیش دەربارەی ئەم مەسەلە بیدعە و داهێنراوە . زانایانی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەم بنەمایە کاریان کردووە سەبارەت بە هەردوو جۆری سیفاتە (ذاتي) و(فعلي) یەکاندا.

# پرسیارەکانی بنچینەی حەوتەمی سیفاتەکان

ئەمە حەوتەمین بنچینەو کۆتـا بنچیـنەیە سـەبارەت بە سـیفاتەکانی اللـە تعـالی، پێشـتریش بە پرسـیار و وەڵام حەوت بنچیـنەی ترمـان خسـتەڕوو سـەبارەت بە ناوەکـانی اللـە تعـالی و، بەمشـێویەش فێرخـوازی زانسـت بنچیـنە پێویسـت و سەرەتاییەکانی زانی دەربارەی ئەسمائوسیفاتەکانی الله تعالی.

**پرسیاری ١/** حەوتەمین بنچینە چیـیە کە پێویسـتە دەربـارەی سـیفەتەکانی اللـە عزوجل بیزانین؟

**وەڵام/** ئەو بنچینەیە بریتییە لە: (صفات الله تعالى توقيفية لا مجال للعقل فيهـا) واتە: سـیفەتەکانی اللـە تعـالی هەمـووی ڕاوەسـتاوە لەسـەر دەقە شـەرعییەکان و لەڕێگەی قورئان و سوننەتەوە دەزانرێت و جێگیر دەکرێت، بوارێك نیـیە بـۆ عەقـڵ لە دەرەوەی دەقەکانەوە ئیشی تێدا بکات.

پێشەوا أحمد بن حنبل رحمه الله فەرموویەتی: ( لا يوصف الله إلا بما وصف به نفسه أو وصفه به رسـوله، لا يتجـاوز القـران والحـديث). الفتـوى الحمويـة ٢٧١. واتە: الله تعالى تەنها بەوە وەسف دەکرێت کە خۆی خۆی پێ وەسف کردووە، یـان پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم ئەوی پێ وەسف کردووە، نابێـت لەو بـارەوە لە بەڵگەی قورئان و سوننەت دەربچین.

**پرسیاری٢ /** بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی سیفەتەکانی الله تعالى تەوقیفیە و تەنها لەڕێگەی ئایەت و فەرمودەوە وەردەگیرێت؟

**وەڵام/** بەڵگەی ئایەتی قورئانی پیرۆزە: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ الأعراف: ٣٣. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ بۆی نییە شتێك دەربارەی پەروەرگاری بڵێت بەبێ بەڵگەیەکی قورئان و سوننەت.

پرسیار ٣/ سەبارەت بە سیفەتەکانی الله عزوجل، ئاماژەکانی قورئان و سوننەت سێ ئاراستەیان هەیە، ئەو ئاراستانە چین؟

**وەڵام/** ١- بریتییە لە باسکردنی سیفەتەکە بەڕاشکاوی، وەکو سیفەتی (العزة) لە ئایەتی: ﴿فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ [النساء: ١٣٩]، هەروەها سیفەتی (البطش) لە ئایەتی: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴾ [البروج: ١٢]، هەروەها سیفەتی (اليدين )لە ئایەتی: ﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴾ [المائدة: ٦٤.

٢- ناوەکان سیفەت لە خۆ دەگرن، بۆ نمونە: ناوی (الغفور) سیفەتی (المغفرة) واتە لێخۆشبوون لە خۆ دەگرێت، ناوی (السميع) سیفەتی (السمع) واتە بیستنی لە خۆ گرتووە، ناوی ( العزيز) سیفەتی (العزة) ی لە خۆ گرتووە واتە بەهێز و بەتوانا.

٣- دەربڕینی ڕاشکاوانە بە کردارو وەسفێك کە ئاماژە بۆ ناوو سیفەتێك بکات، وەکو:

* (الاستواء على العرش) واتە: چوونە سەر عەرش. (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى). [طه:٥] .

* (والنزول إلى السماء الدنيا) واته: دابه‌زين بۆ ئاسمانى دونيا: (ينزل ربنا إلى السماء الدنيا) (١)

* (المجيء للفصل بين العباد يوم القيامة) واته: هاتنى الله تعالى بۆ لێپرسينه‌وه‌و يه‌كلاكردنه‌وه‌ له‌ نێوان به‌نده‌كانيدا. (وَجَاء رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا) سورة الفجر/ ٢٢.

* (الإنتقام من المجرمين) واته: تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌ له‌ تاوانباران. (إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ). [السجدة:٢٢].

(١) رواه البخاري (١١٤٥)، ومسلم (٧٥٨).

# چۆنیتی مامەڵە کردن لە گەڵ بەڵگەکاندا

دانەری کتێبی (القواعد المثلی) پاش ئەوەی بنەما و بنچینەکانی مامەڵە کردنی لە گەڵ (الأسماء و الصفات)دا خستە ڕوو، ئینجا هەڵسا بە خستنەڕووی چەند بنەمایەکی تر بۆ چۆنیتی مامەڵە کردن لە گەڵ بەڵگەکانی ئەو بنەمایانە کە لێرەدا ئێمەش بە شێوازی پرسیار و وەڵام دەیانخەینەڕوو:

**پرسیار ١/** سەبارەت بە ناو و سیفەتەکانی الله تعالی، چین ئەو چوار بنچینەیە کە پێویستن دەربارەی بەڵگەکانیان بیانزانین؟

**وەڵام/** دانەری (القواعد المثلی) چوار بنچینەی لەو بارەوە داناوە کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

بنچینەی یەکەم: ئەو بەڵگانەی کە لە ڕێگەیانەوە ناو سیفەتەکانی اللە تعالی ی پێ جێگیر دەکەین، بریتین لە کیتاب و سوننەت، بۆیە هیچ ناوو سیفەتێك جێگیر ناکەین بەبێ بەڵگەی ئایەتێك، یان فەرموودەیەکی ڕاست و درووست.

هەرچی لە قورئان و سوننەتدا بۆ الله تعالی جێگیر بووە لە ناو و سیفەتەکانی، واجبە بۆی جێگیر بکرێت، ئەوەشی نکۆڵی لێکراوە، پێویستە نکۆڵی لێ بکەین و پێچەوانەکەشی لە ئەوپەڕی تەواویدا جێگیر بکەین، ئەوەشی نە بە جێگیر بوون و نە بە نکۆڵی لێکردن هیچ لە قورئان و سوننەتدا دەربارەی نەهاتبێت، پێویستە لەو وشەو لەفزەدا بوەستین و هیچ نەڵێین، چونکە بەڵگەی جێگیر کردن و نکۆڵی لێکردنیان نییە. بەڵام سەبارەت بە واتاکەی دەبێت شیبکرێتەوە، ئەگەر واتایەکی شیاو بوو بۆ الله تعالی وەریدەگرین، ئەگەر واتایەکی نەشیاو بوو بۆ اللە تعالی ڕەتیدەکەینەوە.

سەبارەت بەوانەی کە بۆ الله تعالى جێگیر دەکرێت، هەموو سیفەتێك کە ناوێك لە ناوەکانی الله تعالى ئاماژەی بۆ بکات لە ڕێگەی (المطابقة و التضمين و الإلتزام) کە پێشتر ئەوەمان باس کردووە لەم زنجیرەیەدا.

- هەروەها هەر سیفەتێکی الله تعالى کە کردارێك لە کردارەکانی ئاماژەی پێ بکەن، وەکو (الاستواء على العرش) ( المجيء يوم القيامة للفصل بين العباد) و(النزول إلى السماء الدنيا). وەکو الله تعالى فەرموویەتی: " ويفعل الله ما يشاء " إبراهيم/٢٧.

- هەروەها سیفەتی (الوجه و العينان و اليدان) ڕوخسار و چاو و دەست.

- هەروەها (الكلام والمشيئة والإرادة الكونية و الشرعيه) واتە سیفەتی قسەکردن و ویستن و بە هەردوو جۆری الكوني ئەوەی کە دەوێت بیکات و الشرعي ئەوەی کە پێی خۆشویستن دیت ئەمانەش دانەر ئاماژەی بەوە کردووە کە بەڵگەکاتی لە کتێبەکانی عەقیدەدا هاتووە.

- هەروەها سیفەتەکانی (الرضى والمحبة و الغضب و الكراهة...) واتە ڕازیبوون و خۆشەویستی و توڕەبوون و ڕق لێبوون و ...هتد.

- سەبارەت بەو سیفەتانەش کە پێویستە نکۆڵی لێ بکرێت بۆ الله تعالى و پێچەوانەکەی بەتەواوی جێگیر بکرێت، وەکو: (الموت و النوم و السنة و العجز و والإعياء و الظلم و الغفلة عن أعمال العباد، وان يكون له مثيل أو كفؤ ونحو ذلك) واتە: مردن و خەوتن و وەنەوز و بێ توانایی و ماندوو بوون و ستەم و بێ ئاگایی لە کردەوەی بەندەکان و هەروەها ئەوەی کە الله تعالى هاوشێوە و هاوتای هەبێت و شتی لەو شیوە. هەموو ئەو سسیفەتانە دەبێت سەبارەت بە الله تعالى نکۆڵی لێ بکرێت و پێچەوانەکەشی بە ئەوپەڕی کامڵی و تەواوی بۆی جیگیر بکرێت.

- ئەوەشی کە لە قورئان و سوننەتدا نە بە جێگیـر بـوون و نە بە نکـۆڵی لێکـردن هیچی لەسەر نەهاتووە، وەکو وشەی (الجهة) واتە ئاراستە و لایەن، ئەگەر کەسێك پرسیار بکات: ئایا دەتوانین جیهەت و ئاراستە بۆ الله تعـالی دیـاری بکەیـن؟ پێـی دەڵێین وشەی جیهەت و ئاراستە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتووە و ئەوەندە بەسە کە بوترێت الله تعالی لە ئاسمانە وەکو جێگیر بووە، بۆیە وەکو وشـە بەکـاری نـاهێنین، بەڵام وەکو واتا دەڵێین: ئەگەر مەبەست بەو (جهة) و ئاراستەو جـێگەیە شـوێنێکی نزمی بێت، واتە شتێك وەکو ئاسمانەکان لە سەررووییەوە بن، بۆ نموونە لەو کاتەی کە الله دیتە ئاسمانی دونیا ناوترێت و درووست نییە بوترێت ئاسمانی دووەم لەسەررووی الله ەوەیە، بۆیە ئەوە باتڵە و درووست نییە وا بوترێت بەبەڵگەی کیتاب و سـوننەت و ئیجماع و فیترەت.

یان مەبەست لە بەرزییەك بێت کە دەوری الـلـە تعـالی ی دابێـت ئەو بەرزیـیە، ئەوەش بە هەمان شیوە هەر باتڵە و درووست نییە وا بوترێـت، چـونکە الـلـە تعـالی لەوە مەزنتر و گەورترە شتێك دەورەی بدات.

یان مەبەسەت لە (جهة) بەرزییەکە کە هیچ دەورەی نەدابێـت، ئەوەیـان حەقە و الله تعالی لە سەرووی درووستکراوەکانێتی و هیچ شتێك نییە بتوانێت دەورەی الله بدات.

بەڵـگەی ئەم بنچیـنەیەش واتە بنچیـنەی یەکەم بـریتییە لە ئەو بەڵگـانەی پێـی دەوترێت سـەمعی لە دەقەکـانی کیتـاب و سـوننەت، هەروەهـا بەڵگەکـانی عەقـڵ، سەبارەت بە دەقەکان:

- (وَهَـٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) الأنعام/١٥٥.

- (فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) الأعراف/ (١٥٨).

- «وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا» الحشر/٧.

- (مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا) النساء/ ٨٠.

- (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) النساء/ ٥٩.

- (وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ) المائدة/ ٤٩. له‌گه‌ڵ زۆر ئایه‌تی تر كه‌ هه‌مووی ئاماژه‌یه‌ بۆ باوه‌ڕ هێنان به‌وه‌ی له‌ قورئان و سوننه‌تدا هاتووه‌. هه‌موو ده‌قێكیش فه‌رمانی تێدا بێت بۆ شوێنكه‌وتنی قورئان له‌ هه‌مان كاتدا فه‌رمانه‌ به‌ شوێنكه‌وتنی سوننه‌تیش، باوه‌ڕ نه‌هێنان و ڕه‌تكردنه‌وه‌ی سوننه‌ت وه‌كو باوه‌ڕنه‌هێنان و ڕه‌تكردنه‌وه‌ی قورئانه‌.

- له‌ ڕووی عه‌قڵیشه‌وه‌ به‌ڵگه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ قسه‌كردن و شیكردنه‌وه‌ی باسه‌كان سه‌باره‌ت به‌ الله تعالى چی ئه‌بێت و نابێت ئه‌وه‌ غه‌یب و نادیاره‌ و به‌ عه‌قڵ و به‌ مه‌زه‌نده‌ ناتوانرێت هیچ حه‌قیقه‌تێك به‌ده‌ست بهێنرێت ، بۆیه‌ پێویسته‌ له‌وانه‌دا بگه‌رێینه‌وه‌ بۆ ده‌قه‌كانی قورئان و سوننه‌ت و به‌ عه‌قڵی خۆمان ده‌رباره‌ی الله و ناوو سیفه‌ته‌كان شته‌كان لێكنه‌ده‌ینه‌وه‌ به‌ تێگه‌یشتنی خۆمان وچه‌مكه‌ و واتاكان دیاری نه‌كه‌ین.

**پرسيار/** سه‌باره‌ت به ناو و سيفه‌ته‌كانی الله تعالی، بنچينه‌ی دووه‌م چييه كه پێويسته ده‌رباره‌ی به‌ڵگه‌كانيان بيانزانين؟

**وه‌ڵام/** بنچينه‌ی دووه‌م: ( الواجب في نصوص القرآن والسنة إجراؤها على ظاهرها دون تحريف لا سيما نصوص الصفات حيث لا مجال للرأي فيها) واته: سه‌باره‌ت به ئايه‌ته‌كانی قورئان و فه‌رمووده‌كان ده‌رباره‌ی ناوو سيفه‌ته‌كانی الله تعالی پێويسته له‌سه‌رمان له‌سه‌ر ڕواڵه‌ته‌كانيان بڕۆين و واتای ئايه‌ته‌كان نه‌گۆڕين بۆ واتای تر، به تايبه‌ت ئايه‌ته‌كانی سيفات، چونكه هيچ بوارێكی بۆ عه‌قڵی مرۆڤه‌كان تێدا نييه له‌و مه‌سه‌له ئيش بكات.

به‌ڵگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه پێويسته له‌سه‌ر ڕواڵه‌تی ئايه‌ته‌كان و له ڕۆشنايی بنه‌ماكانی زمانی عه‌ره‌بيدا له قورئان تێبگه‌ين - مه‌گه‌ر به‌ڵگه‌يه‌كی شه‌رعی ڕێگر بێت - ئه‌م ئايه‌تانه‌يه:

- (نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ) الشعراء/ ١٩٣-١٩٥.

- (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ). يوسف/٢.

- (إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ). الزخرف/ ٣.

ئينجا الله تعالی سه‌ركۆنه و زه‌می جوله‌كه‌ی كردووه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئايه‌ته‌كانی ته‌وراتيان له ڕواڵه‌ت و زاهيری واتاكانی گۆڕيوه و فه‌رموويه‌تی:

(أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) البقرة/ ٧٥.

**پرسیار/** نموونه چیه لەسەر ئەوەی هەندێ جار ئەگەر بەڵگەی شـەرعی هەبێـت به زاهیری ئایەتەکە ئیش نەکەین؟

**وەڵام /** بۆ نموونه ئایەتی: (فَإِذَا قَـرَأْتَ الْقُـرْآنَ فَاسْـتَعِذْ بِـاللّهِ مِـنَ الشَّـيْطَانِ الرَّجِيمِ) النحل/ ٩٨. بەڵگەی شەرعی هاتووه که پێغەمبەر صلی اللـه علیـه و سـلم پێش دەستپێکردنی قورئان خوێندن دەیفەرموو: (أعوذ باللـه مـن الشـيطان الـرجيم )نەك له دوای تەواوبوونی! هەندێ له زانایـانیش وەکـو (داود الظـاهري) به پێـی ڕواڵەتی ئایەتەکە لەسەر ئەوەن که (أعوذ باللـه مـن الشـيطان الـرجيم ) له کۆتـایی قورئان خوێندنەکەدا دەبێت و خیلافێك لەو بارەوە هەیه.

له ڕووی عەقڵیشەوە که پێویسته لەسەرمان به ڕواڵەتی ئایەتەکـان کـار بکەیـن و تێبگەین ئەوەیه که الله تعالی خۆی له هەموو کەس باشـتر دەزانێـت که مەبەسـتی چییه و هەر خۆیشی به زمانی عەرەبـی فەرموودەکـانی خـۆی ئاراسـته کـردووین و دەبێت ئێمەش بەو شێوه لێی تێبگەین.

**پرسیار/** سەبارەت به ناو و سیفەتەکانی اللـه تعـالی، بنچیـنەی سـێیەم چیـیه که پێویسته دەربارەی بەڵگەکانیان بیانزانین؟

**وەڵام/** ئەو بنچینەیه بریتییه له: (ظواهر نصـوص الصـفات معلومـة لنـا باعتبـار، ومجهولة لنا باعتبار آخر فباعتبار المعنى هي معلومـة، وباعتبـار الكيفيـة التـي هـي عليها مجهولة. ) واته: ڕواڵەتـی ئەو دەقـانەی پەیوەنـدییان به سـیفاتی اللـه تعـالی هەیه، له ڕوویەکەوە زانراوو ئاشکرایه لەلامان، له ڕوویەکی ترەوە نەزانراوو نادیـاره لەلامان، له ڕووی واتاوە ڕوونه و دیاره، بەڵام له ڕووی چۆنێتی و شێوازەوە نادیار و نەزانراوه بۆ ئێمه.

بەڵگەی ئەم بنچینەیە لە ڕووی ئایەتەکانەوە:

- (كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ) ص/ ٢٩.

- (إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) الزخرف /٣.

- (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) النحل/٤٤.

ئەم ئایەتانە باسی تێرامان و بیرکردنەوە دەکەن وەکو دیارە، بیرکردنەوەو تێڕامانیش لە شتێکدا دەبێت کە لەتوانای مرۆڤدا هەبێت لێی تێبگات و پەند وەربگرێت لەوەی کە تیگەیشت، ئینجا لەبەر ئەوەش کە قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی هاتووە وبۆئەوەی کە سێك توانای تێگەیشتنی زمانی عەرەبی هەبێت لێی تێبگات، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەعناو واتاکانی مەعلوم و دیارن، ئەگەرنا جیاوازییەك نەدەبوو لە نێوان ئەوەی بە زمانی عەرەبی یان بەهەر زمانێکی تر بوایە.

ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم یش بە شێوەیەکی گشتگیر بووە بۆ وشەکان و بۆ واتاکانی قورئانی پیرۆز.

لە ڕووی عەقڵیشەوە، مەحاڵە الله تعالى ئەو قورئانەی کە دایبەزاندووە و، ئەو فەرموودانەی کە پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی، کە مەبەست لێیان ڕێنوینی کردنی خەڵکە، لە مەسەلەیەکی وا هەستیار و پێویستدا واتاکانی نەزانراو بن و تەنها بریتی بن لە هەندێ پیتی نادیار لە ڕووی واتاوە! ئەوە کارێکە لەگەڵ حیکمەت و دانایی الله تعالى یەکناگرنەوە.

الله تعالى فەرموویەتی: (الر ۚ كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ) هود /١.

ئەمانە ئاماژەی دەقەکان بوون لە ڕووی زانینمان بۆ واتـای دەقەکـانی تـایبەت بە سیفەتەکان، سەبارەت بە ئاماژەکانیشیان لەسەر نەزانینمان بـۆ شـێوازەکەی ئەوە لە بنچینەی شەشەم لە بنچینەکانی سیفەتەکانی الله تعالى باسـمان کـرد، ئـا لێرەشـەوە هەڵەی ڕێڕەوی ئەوانەی کە پێیان دەوترێت (المفوضة) مان دەردەکەوێت کە زانینـی واتای سیفەتەکان هەواڵەی الله تعالى دەکەن و دەڵێن ئەوە ڕێڕەوی هاوەڵان بووە و لەڕاستیدا هاوەڵان و پێشینان لەو تێگەیشتنە بەریـن و دوورن، لە ڕێـگە زۆریشـەوە لەوانەوە پـێمان گەیشـتووە کە ئەوان واتـای سـیفەتەکانیان هەنـدێ جـار بە تێکـڕا جێگیریان کردوە و هەندێ جاری تر بە شیکراوەیی ئەو دەقانەیان جێگیـر کـردووە، بەڵام زانینی چۆنێتییەکەیان هەواڵەی الله تعالى کردووە.

# چوار بنچینه‌ی گرنگ ده‌رباره‌ی بەڵگه‌ی ناوو سیفاته‌کان

**پرسیار ١/** سه‌باره‌ت به ناو و سیفه‌ته‌کانی الله تعالی، بنچینه‌ی چواره‌م چیـیه که پێویسته ده‌رباره‌ی به‌ڵگه‌کانیان بیانزانین؟

**وه‌ڵام/** ڕواڵه‌تی ده‌قه‌کان بریتییه له‌و واتایانه‌ی که بۆ یه‌که‌م سات خوێنه‌ر لێی تێده‌گات، ئه‌وه‌ش به پێی قسه‌و ده‌ربڕینه‌کان ده‌گۆڕێت، وشه‌ی وا هه‌یه له جێگه‌یه‌کدا و له شێوازێکی ده‌ربڕیندا واتایه‌کی هه‌یه، له جێگه‌ی تر و له شێوازێکی تری ده‌ربڕیندا هه‌مان وشه واتایه‌کی تری هه‌یه، بۆ نموونه: وشه‌ی القرية له ئایه‌تی: ( وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا) الإسراء/ ٥٨. له گه‌ڵ هه‌مان وشه‌ی القرية له ئایه‌تی: ( وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُو أَهْلِ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ) العنكبوت/ ٣١. وه‌کو ده‌رده‌که‌ویت وشه‌که له‌یه‌که‌م ئایه‌تدا به‌واتای ماڵه‌کان هاتووه و له دووه‌م وشه‌دا به‌واتای دانیشتوانی ناو ماڵه‌کان هاتووه.

هه‌روه‌ها سازکردن و پێکهێنانی قسه‌یه‌ك به شێوازێك واتایه‌ك ده‌به‌خشێت و به شێوازێکی تر واتایه‌کی تر ده‌به‌خشێت.

**پرسيار ٢ /** ويست و ئيراده‌ی الله تعالى ده‌بن به دوو به‌شه‌وه، كامانه‌ن ئه‌و دوو به‌شه؟

**وه‌ڵام/** - يه‌كه‌م : ئه‌وه‌يه كه پێی ده‌وترێت ( الإرادة الكونية) كه په‌يوه‌سته به قه‌ده‌ری الله عزوجل، چی بوێت ده‌بێت و چی نه‌وێت نابێت، هه‌موو بوونه‌وريش له چوارچێوه‌ی ئه‌و ئيراده‌و ويستنه‌ی الله تعالى ن، چاكه و خراپه‌ش له‌و ئيراده و ويستنه به‌ده‌ر نين.

**- دووه‌م :** دووه‌م جۆری ويستن ئه‌وه‌يه كه پێی ده‌وترێت: ( الإرادة الشرعية) ئه‌وه‌ش په‌يوه‌سته و تايبه‌ته به‌وه‌ی كه الله تعالى پێی خۆشه و حه‌زی پێ ده‌كات و پێی ڕازی ده‌بێت كه پێيشی ده‌وترێت: (الإرادة الدينية).

**پرسيار ٣ /** ئايا وشه‌ی (الجهة) واته جێگه و لايه‌ن و ئاراسته، جێگير بوه بۆ الله تعالى؟

**وه‌ڵام/** وشه‌ی (الجهة) نه له قورئان و نه له سوننه‌تدا، به بوون و به نكۆڵی لێكردن جێگير نه‌بووه، بۆيه پێويسته ته‌نها پابه‌ند بين به‌وه‌ی كه له‌و دوو سه‌رچاوه‌دا جێگير بووه ئه‌ويش ئه‌وه‌يه الله تعالى له ئاسمانه.

**پرسيار ٤/** سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كه نه له قورئان و نه له سوننه‌تدا جێگير نه‌بووه، ئه‌ركی ئێمه وه‌كو موسوڵمان چييه؟

**وه‌ڵام/** وه‌كو وشه ڕاده‌وه‌ستين و هيچ ناڵێين! به‌ڵام وه‌كو واتا شيكردنه‌وه‌ی بۆ ده‌كه‌ين، ئه‌گه‌ر واتاكه‌ی شياوبوو بۆ الله تعالى وه‌رده‌گيردرێت، ئه‌گه‌ر نا ڕه‌تده‌كرێته‌وه.

**پرسيار ٥/** ئايا ئه‌و ده‌قانه‌ی ده‌رباره‌ی سيفه‌ته‌كانی الله تعالى هاتوون واتاكانيان دياره‌و ڕوونه و به‌ڵگه‌ش چييه له‌سه‌ر ئه‌وه‌؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵێ واتای ئه‌و ئايه‌تانه ڕوون و ئاشكرايه، الله تعالى فه‌رموويه‌تی:

- ( إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ) الزخرف/ ٣. وشه‌ی (تَعْقِلُونَ) واته: له مه‌عناو واتاكانی تێبگه‌ن، چونكه الله تعالى به شتێك گوتاری ئاڕاسته نه‌كردووين كه له‌واتاكانی تێنه‌گه‌ين.

- (كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ) ص/ ٢٩. قورئان بۆ ئه‌وه دابه‌زيوه لێی تێبگه‌ين و له‌سه‌ر ئايه‌ته‌كانی تێڕامانمان هه‌بێت ، جا ئه‌گه‌ر واتاكانی روون و ئاشكرا نه‌بن تێڕامان و بيركردنه‌وه‌ی تێدا ناكرێت. تێڕامان و (تدبر) له شتێكدا ده‌بێت كه گه‌يشتن به واتاكه‌ی كارێكی ئاسان بێت.

# (المفوضة ) و (الممثلة) (المعطلة) كێن؟

**پرسيار ٦/** كێن ئه‌وانه‌ی پێیان ده‌وترێت( المفوضة)؟

**وه‌ڵام/** (المفوضة) ئه‌وانه‌ن كه زانینی واتای سیفه‌ته‌كان هه‌واڵه‌ی الله تعالی ده‌كه‌ن و ده‌ڵێن ئێمه نازانین مه‌عنای چییه و ته‌نها الله تعالی واتاكانی ده‌زانێت.

پرسيار ٧/ به به‌ڵگه‌ی شه‌رعی، حوكمی ئه‌و كه‌سانه چییه كه پێیان ده‌وترێت (المفوضة) ؟

**وه‌ڵام/** ڕێڕه‌وی (المفوضة) پووچ و به‌تاڵه، چونكه ئه‌وان واتای ده‌قه‌كانی سیفاتیان په‌كحستووه، له كاتێكدا الله تعالی فه‌رمانی پێكردووین بیر له‌واتاكانی بكه‌ینه‌وه‌و لێیان تێبگه‌ین، ئیتر چۆن ده‌گونجێت ڕوویان لێ وه‌رگێڕین و له‌واتاكانیان تێنه‌گه‌ین؟

**پرسيار ٨ /** ئایا ئه‌هلی سوننه‌ت له مه‌سه‌له‌ی (التفویض) واتا هه‌واڵه كردنی واتاكان بۆ الله تعالی به شێوه‌یه‌كی ڕه‌ها ڕه‌تده‌كه‌نه‌وه؟

**وه‌ڵام/** نه‌خێر ئه‌هلی سوننه‌ت له‌و مه‌سه‌له‌دا شیكردنه‌وه‌و پۆلێن كردنیان هه‌یه، (تفویض) له واتای سیفه‌ته‌كانی الله تعالی ڕه‌تده‌كه‌نه‌وه و نكوڵی لێ ده‌كه‌ن، به پێچه‌وانه‌ی چۆنێتییه‌كه‌ی ئه‌وه قبوڵ ده‌كه‌ن، واتا واتاكاكه‌ی مه‌علومه و شێواز و چۆنێتی نادیاره و ته‌نها الله تعالی خۆی ده‌زانێت چۆنه.

**پرسيار ٩ /** ڕێڕەوی ئەهلی سونەت سەبارەت بە زاهیر و ڕواڵەتی دەقەکانی سیفات چییە؟

**وەڵام /** ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەن کە زاهیر و ڕواڵەتی ئایەتەکان لە سیفاتدا وەردەگرن و ئاماژەکەی وەکو خۆی دەهێڵنەوە. ئەمەش ڕێڕەوی ڕاست و حەقە لە بەر دوو هۆکار:

١- ئەوە جێبەجێکردنێکی تەواوە بۆ ئاماژەکانی کیتاب و سونەت سەبارەت بە وەرگرتن و کارپێکردنی ئایەتەکانی پەیوەندیدار بە ئەسمائو سیفات.

٢- لەم بارەوە حەق یان لەوەدایە کە پێشینانی چاکی ئەم ئوممەتە وتوویانە، یان لەوەدایە کە غەیری ئەوان وتوویانە، بێگومان یەکەم حەقە و دووەم بەتاڵە، چونکە بە پێی گریمانەی دووەم بێت هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان لە حەق لایانداوە و بۆ جارێکیش ئەو حەقەی کە پێویستە لەوبارەوە باوەڕمان پێی هەبێت ئەوان نەیاندرکاندووە!

**پرسيار ١٠/** ڕێڕەوی ئەوانەی پێییان دەوترێت ( الممثلة) دەربارەی دەقەکانی سیفات چییە؟

**وەڵام/** ئەوان لێچواندن بۆ سیفەتەکان دەکەن، واتایەکی نەشیاویان بۆ زاتی اللە لە ڕواڵەتی دەقەکانەوە دیاری کردووە.

**پرسيار ١١/** حوكمی ڕێڕەوی (الممثلة) چییە؟

**وەڵام/** ڕێڕەوی ئەوان لە چەندین ڕووەوە پووچ و بەتاڵە:

١- ئەوەی ئەوان دەیکەن تاوانێکە بەرانبەر بە دەقەکانی سیفات ئەنجامی دەدەن و جۆرێکە لە پەکخستنی دەقەکان. الله تعالی بە خۆی فەرموویەتی:( لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَىْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ) الشوری/١١.

٢- ئامـاژەی عەقـڵ بـۆ ئەوەیە کە (خـالق) لە زات و لە سـیفاتیدا جیـاوازە لە درووستکراوەکانی خۆی، ئیتر چـۆن لێچوانـدن لە نێـوان خـالق و مەخلوقەکانیـدا دەکرێت؟!

ئەگەر ئەو کەسەی لێچواندنی سیفەتەکانی الله بە سـیفەتی بەنـدەکانی دەکـات وتی: من ناتوانم لە واتای دەسـت و لە واتـای دابەزیـن بـۆ نمـوونە تێـبگەم وەکـو دابەزین و دەستی مرۆڤەکان نەبێت، بەمانەی خوارەوە وەڵام دەدرێتەوە:

* الله کە ئەو گوتارەی ئاراستە کردووین، هەر خۆیەتی کە فەرموویەتی: ( لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَىْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ) الشوری/١١. لە بەندەکانیشـی قەدەغە کـردووە کە نموونەی بۆ بهێننەوە و فەرمـوویەتی: (فَلَا تَضْرِبُواْ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) النحل/٧٤. هەروەها فەرموویەتی: (فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُـونَ ) البقـرة/ ٢٢. فەرموودەکـانیش اللـە یـش هەمـووی ڕاسـتن و لە نێـوان یەکتردا دژوار نینی.

* دەکرێت پێی بوترێت: ئایا تۆ باوەڕت وا نییە کە الله زاتێکی جیاوازی هەیە کە لە کەسی تر ناچێت، کە وتی بەڵێ، پێی بڵێ قسەکردن دەربـارەی سـیفەتەکانی اللـە وەکـو قسـەکردنە دەربـارەی زاتـی مەزنـی و هەرکـێ جیـاوازی لە نیـوان ئەو دوو مەسەلەدا بکات لە حەق و ڕاستی لایداوە.

* هەروەها دەکرێت پێی بوترێت: ئایا لە بـوونەوەردا هـیچ نابینیـت کە لە نـاودا یەکدەگرنەوە و لە چۆنێتیدا جیاوازن؟ کە وتی بەڵێ، پێی بڵێ، بـۆچی ئەو حـاڵەتە لە بـوونەوەردا بە ئاسـایی دەزانیـت و لە نێـوان اللـه و بەنـدەو دروستـکراوەکانیدا بەلاتەوە ئاسایی نییە؟! ئەمە لە کاتێکدایە کە جیاوازی نێوان الله و بەنـدەکانی زۆر گەورەترە لە جیاوازی نێوان بەندەو دروستکراوەکان خۆیان!

٣- ئەو تێگەیشتنەی ئەوان نامۆیە و دژوارە لەگەڵ تێگەیشتنی پێشـینانی چـاکی ئەم ئوممەتەدا .

**پرسیار ١١/** ڕێڕەوی ئەوانەی کە پێیان دەوترێت ( المعطلة) سەبارەت بە ڕواڵەتی دەقەکانی سیفات چییە؟

**وەڵام/** ڕێڕەوی ئەوان بـریتییە لە کـارنەکردن و وەرنەگرتنـی ڕواڵەتـی دەقەکـانی سیفات و لە بەرانبەردا بە عەقڵی خۆیان واتای تریان بۆ دیاریکردووە!

**پرسیار ١٢/** حوکمی ڕێڕەوی (المعطلة) چییە؟

/ ڕێڕەوی ئەوان لە چەندین ڕووەوە پووچ و بەتاڵە:

١- ئەوەی ئەوان دەیکەن تاوانێکە بەرانبەر بە دەقەکانی سیفات ئەنجامی دەدەن و جۆرێکە لە پەکخستنی دەقەکان.

٢- لابردنی واتای ڕواڵەتی ئایەتەکانە بۆ واتـای تـر بەبـێ هەبـوونی بەڵگەیەکـی شەرعی.

٣- قسەکردن و بڕیاردانە دەربارەی الله تعالى بەبێ زانست و بەڵگە. اللـه تعـالى فەرموویەتی: ( قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ

بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ) الاعراف /٣٣.

٤- كارنەكردن بە زاهيرى دەقەكان ناكۆك و دژوارە لە گەڵ ڕێڕەوى سەلەفى ئەم ئوممەتەدا.

٥- دەكرێت بەو كەسەى كە (تعطيل) دەكات لە سيفەتەكانى الله پێى بوترێت: ئايا تۆ لە الله زاناترى بە خۆى؟ پێت دەڵێت نە خێر. پێى بڵێ: ئايا ئەوەى كە دەربارەى خۆى باسى كردووە راستەو حەقە؟ پێت دەڵێت بەڵێ. ئينجا پێى بڵێ ئايا وتەيەك هەيە لە وتەى الله پاراوتر و ڕوونتر؟ پێت دەڵێت نەخێر. پێى بڵێ ئايا الله تعالى ويستوويەتى حەق لە بەندەكانى بشارێتەوە و تێگەيشتنى قورس بكات تاكو خۆيان ماندوو بكەن و بە بيركردنەوەى زۆر بتوانن لە ڕواڵەتى ئايەتەكان تێبگەن؟

لە ڕووى سوننەتيشەوە پێى بڵێ ئايا تۆ لە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم زاناترى بە الله تعالى؟ پێت دەڵێت نەخێر. پێى بڵێ: ئايا ئەوەى كە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم كە دەربارەى الله تعالى وتوويەتى ڕاستەو حەقە؟ پێت دەڵێت بەڵێ. پێى بڵێ: ئايا شارەزاى كەسێكى لە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم زمانپاراوتر بۆ گەياندنى واتاكان؟ پێت دەڵێت نەخێر. پێى بڵێ: ئايا كەس هەيە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دڵسۆزتر لە ئامۆژگاريدا بۆ ئوممەتەكەى؟ پێت دەڵێت نەخێر. ئەو كاتە پيى دەوترێت ئەى ئيتر بۆچى ئەوەى كە الله و پێغەمبەرەكەى صلى الله عليه و سلم لەبارەى ناووسيفەتەكانى الله تعالى جێگيريان كردووە تۆيش جێگيرى ناكەيت

٦ - ئەو كەسەى كە باوەرى بە پەكخستنى سيفەتەكان هەيە كە پێى دەوترێت (تعطيل) هەندێ شت لەسەر خۆى (لازم ) پێويست دەكات و واتاكەى دەكات بە

ماڵ به‌سه‌ر خۆیدا، جا که ئه‌و شتانه‌ش که پێویستی کردوون له‌سه‌ر خۆی نادرووست و پوچه‌ڵ بوون، ئه‌وا (ملزوم) واته پێویست کراوه‌که‌ش هه‌ر نادرووست و پوچه‌ڵه، وه‌کو:

**یه‌که‌م/** ئه‌وانه‌ی که رواڵه‌تی ده‌قه‌کانی سیفاتیان (تعطیل) کردووه، واته: کاری پێ ناکه‌ن و واتاکانیان ده‌گۆڕن، بۆیه ئه‌و کاره‌یان کردووه چونکه باوه‌ڕیان وایه ڕواڵه‌تی ده‌قه‌کان گومانی ئه‌وه‌ی له خۆ گرتووه که لێچواندنی الله ی به‌به‌نده‌کانی تێدا بێت، بۆ نموونه، جێگیر کردنی دوو ده‌ست بۆ الله وه‌کو له ده‌قه‌کاندا هاتووه، ئه‌وان ده‌ڵێن ئه‌گه‌ر جێگیر بکه‌ین واته دوو ده‌ستمان وه‌کو ده‌ستی درووستکراوه‌کان بۆ الله جێگیر کردووه، ئه‌وه‌ش هه‌ڵه تێگه‌یشتنه چونکه باوه‌رهێنان و جێگیر کردنی ئه‌و دوو ده‌سته به‌و شیوه‌یه که شاییسته و گونداو بێت بۆ زاتی مه‌زنی الله نه‌ك وه‌کو ده‌ستی مرۆڤ و درووستکراوه‌کانی تر.

(نعیم بن حماد )که یه‌کێکه له مامۆستاکانی بوخاری فه‌رموویه‌تی: (من شبه الله بخلقه فقد کفر، ومن أنکر ما وصف الله به نفسه فقد کفر، ولیس ما وصف الله به نفسه تشبیها) واته: هه‌رکێ لێچواندنی الله به درووستکراوو مه‌خلوقه‌کانی بکات به‌وه کافر ده‌بێت، ئه‌و که‌سه‌ش که نکوڵی له‌وه بکات که الله تعالی خۆی پێی وه‌سف کردووه ئه‌وه‌ش کافر ده‌بێت، ئه‌وه‌ش که الله عزوجل خۆی پێ وه‌سف کردووه ته‌شبیهو لێچواندنی تێدا نییه.

**دووه‌م/** ئه‌وان به (تعطیل) کردنی سیفه‌ته‌کانی الله تعالی وه‌کو ئه‌وه‌یه بڵێن الله تعالی قورئانێکی دانه‌به‌زاندووه جیاوازی له نیوان حه‌ق و باتڵ و ڕاست و ناڕاستدا بکات، به‌ڵکو مه‌سه‌له‌کان بۆ مرۆڤه‌کان به‌جێهێڵراوه چییان پێ باش و په‌سه‌ند بوو جێگیری بکه‌ن، چیشیان پێ ناپه‌سه‌ند بوو نکوڵی لێ بکه‌ن! پووچه‌ڵ بوونی ئه‌و باوه‌ڕه‌ش ئاشکرایه.

**سێیه‌م/** هه‌روه‌ها به (تعطيل) كردن و په‌كخستنی ده‌قه‌كانی سیفات، ئه‌و واتا ده‌به‌خشێت كه پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه و سلم و هاوه‌ڵان و سه‌له‌فی ئه‌م ئوممه‌ته نه‌زان بوونه و حه‌قیان لێ ئاشكرانه‌بووه، یان زانیویانه و كه‌مته‌رخه‌م بوونه له گه‌یاندنی ئه‌و حه‌قه، هه‌ردوو ئه‌و بۆچوون و گریمانه‌ش باتڵ و هه‌ڵه‌ن.

**چواره‌م/** یان كاره‌كه‌یان ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێت كه فه‌رمووده‌كانی الله تعالى و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی صلى الله عليه و سلم سه‌رچاوه‌یه‌ك نین بۆ بیروباوه‌ڕی موسوڵمانان سه‌باره‌ت به الله كه ناسینی بۆیان گرنگترین مه‌به‌سته‌كانی شه‌ریعه‌تن و ئامانجی هه‌موو په‌یامه‌كانی الله یه بۆ مرۆڤه‌كان، به‌ڵكو سه‌رچاوه عه‌قڵی پڕ له كه‌موكورتی مرۆڤه‌كانه!

**پێنجه‌م/** هه‌روه‌ها ئه‌و ڕێڕه‌وه‌ی ئه‌وان ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێت كه درووسته كه نكوڵی له‌و ده‌قه‌كانه بكرێت كه له الله و له پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یه‌وه صلى الله عليه و سلم جێگیر بوونه! بۆ نموونه الله تعالى فه‌رموویه‌تی: ( وَجَاءَ رَبُّكَ) ئه‌و ئه‌ڵێت نه‌خێر نایه‌ت و واتای ئه‌وه نییه! یان كه پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه و سلم فه‌رموویه‌تی: (يتنزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى السماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول من يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه من يستغفرني فأغفر له). رواه البخاري. ئه‌وان ده‌ڵێن نه‌خێر ئه‌وه به‌و شێوه نییه كه ئێوه لێی تیده‌گه‌ن و به‌واتای دابه‌زینی ڕاسته‌قینه نایه‌ت! له ڕاستیدا نكوڵی كردن له‌وه‌ی كه الله تعالى و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی صلى الله عليه و سلم جێگیریان كردووه پووچه‌له و نادرووسته چونكه هه‌رگیز ناتوانن به ته‌ئویل كردن و لادانی ڕواڵه‌تی ده‌قه‌كان له واتاكانیان له‌و مه‌سه‌له ده‌ربچن! چونكه له‌ناو ده‌قه‌كاندا هیچ به‌ڵگه‌یه‌ك نییه ڕێگه به‌و ته‌ئویل و لادانه له واتاكانی بدات.

ئینجا هەندێ لەوانەی کە (تعطیل) دەکەن ئەوەیان کردووەتە بنەمایەکی جێگیر و نەگۆڕ بۆ هەموو سیفەتەکان، هەندێ جاریش (تعطیل) ەکەیان ناوەکانیش لەگەڵ سیفەتەکاندا دەگرێتەوە و، هەندێکیشیان وەکو ئەشعەری و ماتوردییەکان هەندێ لە سیفەتەکان بۆ اللە جێگیر دەکەن و نکۆڵی لە هەندێکی تری دەکەن، لەو کارەشیاندا واتە لە نکۆڵی جێگیر کردن و ڕەتکردنەوە، دەڵێن ئەوەمان بە پێی ئاماژەی عەقڵ و بیرکردنەوە کردووە. بۆ نموونە هاتنی اللە (وجاء ربك) یان ڕەتکردوەتەوە و دەڵێن عەقڵ ئەوە قبوڵ ناکات، لەو کارەشیاندا دەکرێت پێیان بوترێت: نکۆڵی کردنتان لەوەی کە نکۆڵیتان لێ کردووە بەبەهانەی ئەوەی کە عەقڵ ئاماژەی بۆ ناکات! هەر بەڕێگەی عەقڵەوە دەکرێت ڕەتبکرێتەوە، بۆ نموونە: ئەوان سیفەتی (الإرادة) یان جێگیر کردووە لەبەر ئەوەی زۆر ئایەتی لەسەر هاتووە و هاوکات سیفەتی (الرحمة) واتە بەزەییان رەتکردووەتەوە چونکە بەزەیی پێهاتنەوە نیشانەی نەرمی کەسی خاوەن بەزەییە بەرانبەر ئەو کەسەی کە جێگای بەزەییە و ئەوەش مەحاڵە اللە ی پێ وەسف بکرێت و هەرچی بەڵگەکانی سیفەتی (الرحمة) لە دەقەکاندا هاتووە هەمووی تەئویل دەکەن و دەڵێن مەبەستی دەقەکان ئەوە نییە! خۆیشی لە ڕاستیدا ئایەتی زۆری لەسەر هاتووە و بەڵگەکانی جێگیربوونی سیفەتی (الرحمة) لە ( الإرادة)

زۆرترن و لە رێگەی عەقڵیشەوە هەر دەکرێت ئەوە جێگیر بکرێت و بسەلمێنرێت. بەڵکو بە پێی ئەو بیرکردنەوەو عەقڵ بەکارهێنانەی ئەوان بێت چۆن سیفەتی (الرحمة) واتە بەزەیی ڕەتدەکەنەوە، دەکرێت بەهەمان مەنتیق و بیرکردنەوە سیفەتی (الإرادة) و ویستنیش ڕەتبکرێتەوە، چونکە ویستن بریتییە لە حەزو ئارەزووی کەسی خاوەن ویست بۆ گەیشتن بە شتێك وەکو بەدەستهێنانی بەرژەوەندی یان ڕزگاربوون لە زیان کە اللە تعالی لەو جۆرە نیازانە دوور و پاراوە،

ئینجا ئه‌گه‌ر ئه‌وان به‌وه وه‌ڵام بده‌نه‌وه كه ئه‌وه ویستی مرۆڤه‌كانه به‌و شێوه‌یه نه‌ك په‌روه‌ردگار، به‌وه وه‌ڵام ده‌درێنه‌وه كه سیفه‌تی (الرحمة)ش، كه كه‌موكورتی تێدایه ئه‌وه به‌زه‌یی مرۆڤه‌كانه به‌و شیوه‌یه نه‌ك به‌زه‌یی په‌روه‌ردگار. به‌وه‌ش پووچه‌ڵی ڕێڕه‌وی ئه‌وانه‌ی پێیان ده‌وترێت (المعطلة) ده‌رده‌كه‌وێت، ئیتر چی (تعطیل) ه‌كه‌یان گشتی بێت یان تایبه‌ت بێت به‌ هه‌ندێ له سیفه‌ته‌كان.

هه‌روه‌ها ئاشكرایش ده‌بێت كه ئه‌و ڕێگه‌ی ئه‌شاعیره و ماتوریدیه گرتوویانه‌ته‌به‌ر له تێگه‌یشتنی مه‌سه‌له‌ی ناوو سیفه‌ته‌كانی الله تعالی و ئه‌و به‌ڵگانه‌ش كه ده‌یهێننه‌وه گومانی موعته‌زیله‌و جه‌همییه‌كانی پێ ڕه‌تناكرێته‌وه له‌به‌ر دوو هۆكار:

١- ئه‌و ڕێگه‌و مه‌نهه‌جه‌ی ئه‌وان به‌رپای ده‌كه‌ن ڕێگه‌و مه‌نهه‌جێكی داهێنراوه و بیدعه‌یه، نه پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه و سلم نه هاوه‌ڵانی و شوێنكه‌وتووانیان له‌سه‌ری نه‌بوونه، بیدعه‌ش به سوننه‌ت به‌رپه‌رچ ده‌درێته‌وه نه‌ك به بیدعه‌یه‌كی تر.

٢- موعته‌زیله‌و جه‌همییه‌كان ده‌توانن پاڵپشت به هه‌مان ڕێگه‌و مه‌نهه‌جی ئه‌شاعیره‌و ماتوریدییه وه‌ڵامیان بده‌نه‌وه و سه‌باره‌ت به نكۆڵی كردن له سیفه‌ته‌كانی الله تعالی ئه‌وان به‌چی به‌ڵگه‌یه‌ك نكۆڵییان لێ كردووه ئه‌وانیش به‌هه‌مان ئه‌و به‌ڵگانه نكۆڵی لێ بكه‌ن، مه‌سه‌له‌كه له‌لای ئه‌شاعیره‌و ماتوردییه زیاتر نییه له به‌كارهینانی عه‌قڵ و تێگه‌یشتنی كه‌سێتی و ته‌ئویلكردنی ده‌قه‌كان بۆ ڕه‌تكردنه‌وه‌ی هه‌ندێ له سیفه‌ته‌كان، موعته‌زیله‌و جه‌همییه‌كانیش به‌هه‌مان شێوه ده‌توانن هه‌موو سیفه‌ته‌كان به‌و مه‌نهه‌ج و تێگه‌یشتنه ڕه‌تبكه‌نه‌وه.

موعته‌زیله‌و جه‌همییه‌كان ده‌توانن به ئه‌شاعیره‌و ماتوریدییه‌كان بڵێن: ئێوه به‌بههانه‌ی شوێنكه‌وتنی عه‌قڵ ڕێگه‌تان به خۆتان داوه ئه‌و سیفه‌تانه‌ی كه باوه‌ڕتان

وایه پێویسته لەسەر حەقیقەتەکەی لابدرێت و واتای ڕواڵەتی ئایەتەکانتان تەئویل بکرێت (تعطيل) تان کردووه، ئیتر بۆچی ڕەخنە لە ئێمە دەگرن کە ئێمەش هەروەکو ئێوەمان کردووه و بەبەڵگەی عەقڵ کارمان کردووه و ئایەتەکانمان وەکو ئێوه تەئویل کردوه بۆ واتای تر؟

ئەگەر پێیان دەڵێن عەقڵی ئێوه هەڵە لە مەسەلەکە تێگەیشتووه، ئەی کێ دەڵێ عەقڵی ئێوه پێکاوێتی وباش تێگەیشتووه؟ ئەوان دەتوانن پێیان بڵێن ئێوه هیچ بەڵگەیەکی زانستیتان بەرانبەر ئێمە نییە جگە لە شوێنکەوتنی ئارەزووی خۆتان نەبێت.

ئەو ڕەخنەی جەهمی و موعتەزیلەکان لە دژی ئەشاعیرەو ماتوردییەکان لە ڕاستیدا ڕەخنەیەکە لە جێی خۆیدایە و ڕێگای ڕاستیش ئەوەیە بۆ تیگەیشتنی ئایەت و فەرموودەکانی دەربارەی سیفەتەکانی الله تعالى بگەڕێینەوە بۆ تێگەیشتنی پێشینانی چاکی ئەم ئومەتە و ئەوەی الله تعالى لە قورئاندا یان لە سەر زاری پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم بۆ خۆی جێگیری کردووه ئێمەش جێگیری بکەین بەبێ لێچواندن و شێوه بۆ دانان و بەبێ تەئویل و تعطيل و لابردنی ڕواڵەتی ئایەتەکان بۆ واتای تر کە بەهیچ شێوەیەك نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا نەهاتووه، بەڵکو تاقمە لادەرەکان خۆیان ئەو شێواندنەیان بەلاوه باش و پەسەند بووه، ڕاستی فەرمووه الله تعالى: ( وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ) النور/٤٠.

**پرسيار ١٣/** ئايا هه‌موو (معطل) يێك ( ممثل) و به پێچه‌وانه‌شه‌وه هه‌ر ڕاسته و به‌ڵگه‌ش چييه له‌سه‌ری؟

**وه‌ڵام/** به‌ڵێ ئه‌و قسه درووسته و ڕاسته، چونكه ئه‌و كه‌سه‌ی كه ده‌قه‌كانی سيفات په‌كده‌خات و كاری پێ ناكات، له‌به‌ر ئه‌وه كاری پێ ناكات و وه‌ريناگرێت، چونكه به شياوی نازانێت و باوه‌ڕی وايه ئه‌گه‌ر ده‌قه‌كانی سيفات وه‌كو خۆی وه‌ربگرێت لێچواندنی له نێوان الله و درووستكراوه‌كانيدا كردووه، كه‌واته يه‌كه‌م جار لێچواندنی كردووه و دووه‌م جار ده‌قه‌كانی له كارخستووه!

هه‌موو كه‌سێكيش كه لێچواندن بۆ سيفاته‌كان بكات (معطل)ه و ده‌قه‌كانی په‌كخستووه، ئه‌ويش له چه‌ند ڕووه‌يه‌كه‌وه:

- له كارخستنی خودی ده‌قه‌كه كه سيفه‌ته‌كه‌ی پێ جێگير كردووه و وای لێكردووه ئاماژه بۆ لێچواندن بكات و له واتا ڕاسته‌قينه‌كه‌ی خۆی دووری خستووه‌ته‌وه.

- په‌كخستنی هه‌موو ده‌قێك ئاماژه‌يه بۆ نكوڵی كردنی هاوشێوه بوون له‌گه‌ڵ الله تعالى دا.

- لێچواندنی خالق به درووستكراوه‌كانی، په‌كخستنه بۆ ته‌واويی و بێ عه‌يب و خه‌وشی الله تعالى تعالى كه واجبه باوه‌ڕمان وابێت كه الله عزوجل له ئه‌وپه‌ڕی ته‌واويی و بێ عه‌يبيدايه.

# کۆتایی

لەم چەند لاپەڕەیەدا، بە شێوەی پرسیار و وەڵام و هاوکات لەگەڵ کورتکردنەوەشدا، هەڵساین بە کارکردن لەسەر کتێبی (القواعد المثلى) بە مەبەستی پوخت کردنەوە و ئاسان کردنی بابەتەکانی، کە بریتین لە سەرەکیترین بەش لە بەشەکانی عەقیدەی ئیسلامی و تایبەتە بە ناو و سیفەتەکانی الله تعالى لە ڕوانگە و دیدی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە.

بەشی یەکەمی ئەم نامیلکەیە تایبەت بوو بەو بنەماو بنچینانەی پێویستە موسوڵمان بیزانیت سەبارەت بە ناوەکانی الله تعالى، بەشی دووەمیش بریتی بوو لە کۆمەڵە بنەما و بنچینەیەکی تر بۆ چۆنێتی مامەڵەکردنی موسوڵمان لە گەڵ ئەو ئایەت و فەرموودانەی دەربارەی سیفەتەکانی الله تعالى هاتوون، بەڵام بەشی کۆتایی کە بەباشمان زانی ئەوەندە لەو کتێبە بخەینەڕوو بریتی بوو لە خستنەڕووی هەندڕ پێوەر بۆ چونیەتی مامەڵە کردن لە گەڵ ئەو بەڵگانەی کە هاتوون لە دەقەکاندا سەبارەت بە مەسەلەی الأسماء و الصفات و ناساندنی ئەو فیرقە و کومەلانەیە لە ئەهلی سوننەت لایان داوە وعەقڵ وتێگەیشتنی خۆیانیان پیش دەقەکان خستووە و بەوەش گومڕابوون و بەهیلاک چون .

داواکارم لە الله عزوجل ئەم نامیلکەیە بکاتە مایەی سوود و بە کردەوەیەك لێمانی قبوڵ بکات کە لە خزمەتی دینەکەیدا بێت و ڕۆشنکەرەوەی ڕێگا بێت بۆ فێرخوازانی زانستە شەرعییەکان بەگشتی و بۆ ڕێبوارانی ڕێگای تەوحید بە تایبەتی.

والله الموفق.

# پاشكۆكەیەك دەربارەی فیرقە و تاقمە لادەرەكان

ڕوونكردنەوەیەك دەربارەی ئەم پاشكۆیە:

ئەم وتارانەی لەم پاشكۆیەدا هاتوون، بریتین لە كۆمەڵە بابەتێك كە لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكاندا پێشتر بڵاوكراونەتەوە و لەیەك كاتدا نەنووسراون، خاڵی هاوبەشی نێوانیان ئەوەیە بە گشتی باس لە فیرقە و تاقمە لادەرەكانی مێژووی ئیسلامی دەكات كە لە سەردەمی سەلەف و دوای ئەواندا سەریان هەڵدا و خاڵە سەرەكییەكانی بیروباوەڕ و عەقیدەكەیان و جیاوازییان لەگەڵ عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەخاتە ڕوو.

لە باسەكاندا هەوڵمداوە سەرەتا پێناسەیەك بۆ ئەو كۆمەڵ و تاقمانە بكەم و ئینجا دیارترین بنچینەو بنەماكانی بیروباوەڕیان بخەمەڕوو وهەندێ جاریش هەڵوێستی زانایانی ئەهلی سوننەتم لەسەر ئەو تاقمانە و بیروبۆچوونەكانیان باس كردووە.

هۆكاری جێگیر كردنی ئەم وتارە نووسراوانە پەیوەندی بەهێزی ئەم بابەتانەیە بە ناوەڕۆكی ئەم شەرحەی بۆ كتێبەكەی پێشەوا أحمد بن حنبل لێرەدا كردوومانە، كە لە ڕاستیدا ئەم وتارانە ئاوێتەیەكە لە كۆكردنەوەی قسە و نووسین وفەتوای ئەهلی عیلم دەربارەی ئەو تاقمانە، هاوكات لەگەڵ هەبوونی ڕەهەندێكی توێژینەوەیی و بەستنەوەی بابەتە توێرییەكان بە واقیعی ئەمڕۆ كە بریتییە لە خوێندنەوەو تێگەیشتن و پەراوێزی خۆم لەسەر ئەو بابەتانە.

لەناو كتێبی ( القواعد المثلى فی صفات الله و أسمائه الحسنى) كە بە شێوەی پرسیار و وەڵام بە كوردیمان كرد، ناوی كۆمەڵێك لە فیرقەو تاقمەكان هاتووە، وەكو مرجئة وجهمية ومعتزلة و معطلة و جبرية وأشاعرة وتاقمی تر، بۆیە بەباشمان زانی

ئەم پاشــكۆیە وەكــو بەرچــاڕوونی لەبەر دەســتی خوێنەرانــدا بێــت بــۆ ئەوەی پێناسەیەكی ئەو تاقم و كۆمەڵانەی لابێت كە لە ناو كتێبەكەدا ئاماژەیان پێ كراوە.

دەپــاڕێمەوە لە پەروەردگــار ئەم بەرهەمە بە كردەوەیەكــی چــاكە و بە خزمەتــی دیــنەكەی قبــوڵ بفەرموێــت و وبەرەكەت و پیتــی تێبخــات و ببێــتە مــایەی خێــر و پاداشت بــۆ هەمــوو كەسێك كە ڕۆڵــی لە بەبەرهەم هــاتنی ئەم كتێــبەدا بــووە هەر لەدانەر تاكو خوێنەر.

إحسان برهان الدين

٢٩ ذو القعدة ١٤٤٤ بەرانبەر ١٨ حوزەیران ٢٠٢٣

سلێمانی گرین سیتی

# مورجیئەكان

مورجیئە فیرقە و تاقمێكە لە تاقمە گومڕاكانی ئیسلام كە لەسەر الصراط المستقیم لایانداوە، بۆیە پێیان وتراوە مورجیئە چونكە لە مەسەلەی ئیماندا قەول پێش دەخەن و كردار دوا دەخەن! مورجیئەش وەكو ئەشاعیرەو خەواریج جۆریان زۆرە، بەڵام ناودارترین فیرقەكانیان دوو جۆرن:

یەكەم / مرجئة الفقهاء : ئەم جۆرە پێیان وایە كە ئیمان بریتییە لە دانانان وشایەتمان هێنان به زمان و باوەڕ هێنان بە دڵ، بەلای ئەوانیشەوە ئیمان نەزیاد دەكات و نەكەم، أبو جعفر الطحاوي لەو مەسەلەدا تووشی هەڵەی مورجیئە بووە لە عەقیدەدا كە دەڵێت: (والإیمان هو الإقرار باللسان والتصدیق بالجنان، وجمیع ما صح عن رسول الله صلى الله علیه وسلم من الشرع والبیان كله حق، والإیمان واحد، وأهله في أصله سواء، والتفاضل بینهم بالخشیة والتقى ومخالفة الهوى، ملازمة الأولى). هەروەها ئەبوحەنیفە و حەمادی كوڕی سولەیمانی مامۆستای و ئەو مورجیئانەی كوفە كە شوێنیان كەوتن لەوەی كە كردەوەیان لە ئیمان جیاكردەوە، لەم جۆرە مورجیئانە دەژمێردرێن.

دووەم/ مرجئه المتكلمین: ئەمانە بریتین لە جەهمییەكان و ئەوانەش كە لەسەر ڕێبازیانن لە ئەشاعیر ە و ماتوریدییەكان، الفضیل بن عیاض دەربارەیان دەڵێت : " أهل الإرجاء - إرجاء الفقهاء - یقولون : الإیمان قول بلا عمل، وتقول الجهمیة: الإیمان المعرفة بلا قول ولا عمل، ویقول أهل السنة: الإیمان المعرفة والقول والعمل " ( تهذیب الآثار الطبري ١٨٢/٢). واتە: مورجیئەی فوقەها دەڵێن ئیمان گوفتارە بە

بێ كردار ، جەهمییەكان دەڵێن ئیمان تەنها زانینە بەبێ گوفتار و بەبێ كردار، بەڵام ئەهلی سوننەت ئەڵێن: ئیمان زانین و گوفتار و كردارە پێكەوە.

سەلەف زۆر لە دژی مورجیئەكان توند بوونە و ڕایان لە ئەواندا گەلێك خراپ بووە ، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: : " المرجئة مثل الصابئين " واتە مورجیئە وەكو سابیئەكانن، هەروەها پێشەوا زوهری دەیفەرموو: " ما ابتدعت فی الإسلام بدعة هی أضر علی أهله من هذه - يعنی الإرجاء - " . واتە لە ئیسلامدا هیچ بیدعەیەك دانەهێنراوە زیانی زۆرتر بێت لە زیانی مورجیئەكان لەسەر موسوڵمانان. ابن بطة دەڵێت: (أما المرجئه فعلی دين الملوك ). واتە مورجیئە لەسەر دینی پاشاكانن ئەوان چۆنیان بوێت وایان بۆ دەكەن. النضر ابن شميل دەلێت: ( الإرجاء دين يوافق أهواء الملوك ) واتە دینی مورجیئە بەدڵی پاشا و سەرۆكەكانە، بە گشتی سەلەف و ئەوانەی دوای ئەوانیش لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت توند بوونە لەسەر مورجیئە و هەجریان كردوون وقسەیان لەگەڵیان نەكردووە.

بەڵام مورجیئەش وەكو تاقمەكانی تر جۆریان زۆرە و هەموویان لە مەسەلەی لادان لە مەنهەجی ئەهلی سوننەتدا بە یەك ئاست و شێواز نین، هەندێكیان هەن كە باوەڕیان وایە ئیمان تەنها وتنی شایەتمانە و تەواو، هەیانە دەلێن نەخێر جگە لە وتنی شایەتمان ئەبێت كەسەكە لە دڵیشەوە باوەڕی هەبێت، توندڕەوەكانیان بە دووری مەگرە فیرعەون و ئەبوجەهلیش بە ئیماندار بزانن وەكو محمد صالح المنجد دەڵێت، ئەوەشی كە مورجیئەیەكی توندڕەو نییە بۆی هەیە تەنها ئەبوبەكر اللە لێی ڕازی بێت بخاتە هەڵەوە لە مەسەلەی شەڕكردنی لەگەڵ ئەوانەی كە زەكاتیان نەدەدا.

نیشانەكانی مورجیئە كە پێی دەناسرێنەوە:

١- بە پـێچەوانەی ئەهلـی سـوننەتەوە، مـورجیئە عیبـادەت و كـردەوە بە مەرج نازانن بۆ ڕاست و درووستی ئیمان، واتە كەسەكە بەبێ عەمەل دەگونجیـت ئیمانـدار بێت. گرنگ ئەوەیە ئیمان لە دڵدا بوونی هەبێت! واتە ئیمان لەلای مـورجیئە بـاوەڕی دڵە و قەولی زمانە و تەواو، كردەوەش هەبێت باشە ئەگینا عەمەل بەلایـانەوە (شرط كمال) ی پـی دەوترێـت نەك (شرط صـحة)! نەبـوونی كـاریگەری خراپـی لەسـەر ئیمانەكە نییە!

٢- لە مەسەلەی تەكفیریشدا بە پێچەوانەی ئەهلی سوننەتەوە، مـرۆڤ تەنهـا بە كوفری دڵی كافر دەبێـت نەك بە كـوفری زمـان و كـردەوە. بـۆیە ئەگەر كەسـێك لە دڵیدا ئیمانی هەبێت و بە زاهیر و كردەوەكانی كوفری لـێ ببینرێـت ئەوە مەرج نیـیە كافر بێت تا خۆی نەڵێت من لە دڵیشەوە هەر بێ بڕوام! هەروەهـا ئەوەی كە هـیچ كردەوەیەكی نەبێـت بەلای مورجیئەكـانەوە كـافر نابێـت ئەگەر لەنـاو دڵیـدا ئـیمان هەبێت.

٣- مورجیئە هەمیشە بەوە ناسراون كە بەرگری لە ستەمكاران و تاغوتـان دەكەن و پاساویان بۆ دەهێننەوە و بەرگریان لێ دەكەن و پاسـاو بـۆ كـردەوە خراپەكانیـان دەهێننەوە و خۆیانی لێ كەڕ دەكەن، سەرۆك و پادشاكان هەرچەند لە دینیش دوور بن ئەوان هەر هانی خەڵكی ئەدەن لە قسەیان دەرنەچن و گوێڕایەڵییان بكەن. بـۆیە سەلەف پێیان وتوون لەسەر ئایینی پادشاكانن.

٤- كافر بەكافر نازانن با هەرچەندیش بە كردەوەیان وابن، چونكە ئەڵێن گرنـگ ئیمانی ناو دڵە و كێ دەڵێت ئەم كەسەی كە بە زمانی كوفر دەكات یان جنێو بە اللـه و بە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دەدات لە دڵەوە ئیماندار نییە، بۆیە بە دەگـمەن مورجیئەیەك هەبێت هیچ كافرێك بە كافر بزانێت، جاری وا هەیە لەوەش زیـاتر ئەو

كەسـەی كە دژایەتـی ئیسـلامیش دەكـات ئەوان بە وەلـی ئەمـرو بە سـەركردەی موسوڵمانی دەزانـن كە واجبـی سەرشـانیتی گـوێڕایەڵی بێـت، بـۆیە دەسـەڵاتداران هەمیشە حەزیان پێیانە و لە درێژایی مێژوودا ڕێزی زۆریان لێ گرتوون.

٥- دەڵێن: الإیمان لا یزید ولا ینقص: واتە ئیمان لە دڵدایە و جێگیرە، یـان هەیە و یـان نیـیە! نەزیـاد دەكـات و نەكەم دەكـات، ئەوەش لە كاتێكـدایە ئـایەت و فەرموودەیەكی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی ئیمان بە كردەوەی بـاش زیـاد دەكـات و بە كردەوەی خراپ كەم دەكات، البغوي بە ڕەحمەت بێت دەڵێـت: "اتفقـت الصـحابة، والتابعون، فمن بعدهم من علماء السـنة، عـلى أن الأعـمال مـن الإیمـان" هەروەهـا فەرموویانە: "إن الإیمان قول وعمل وعقیدة، یزید بالطاعة وینقص بالمعصـیة، عـلى ما نطق به القرآن في الزیادة، وجاء في الحدیث بالنقصان". [شرح السنة: ٣٨/١].

٦- لە نیشـانەكانی تـری مورجیئەكـان ئەوەیە كە هەمیشـە ئەهلـی سـوننەت و جەماعەت بە خەواریج وەسف دەكەن.

٧- مورجیئەی فوقەها باوەڕیان وایە موسولمان بۆی نیـیە (اسـتثناء ) لە باوەڕیـدا بكات، واتە بۆی نیـیە بڵـێ مـن إن شـاء اللـه ئیمانـدارم، بەڵكـو دەبێـت بڵێـت مـن ئیماندارم.

٨- هەندیكیشیان هەیە دەلێن مرۆڤ خۆی كردەوەكانی خۆی درووست دەكـات و الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا نابینرێت.

مورجیئە هاوشێوەی خەواریج ئەگەرچی لەم سەردەمە تـاقم و كۆمەڵێـك نیـیە بە فەرمـی هەمـوو بیروباوەڕەكانیـانی هەڵگرتبێـت و وەكـو مورجیئەكـانی سـەردەمانی دێـرین بێـت، بەڵام زۆرێـك لە كەسـایەتی و كـۆمەڵ و تـاقم هەن لە سەرانسـەری جیهـانی ئیسـلامیدا بەشـێكی دیاریـان لە بیروبـاوەڕ و نیشـانەكانی مورجیئەیـان لە خۆیانـدا بەرجەسـتە كـردووە و بانگەشـەی بـۆ دەكەن، بەڵكـو هەنـدێ جـار لە

مورجیئەکـــانی جـــارانیش تونـــدتر و بـــێ شـــەرمتر لادانەکانیـــان دەخەنە ڕوو و بانگەوازی بۆ دەکەن.

بەڵام ئەوەندەی من بزانم لە ئێستادا نە مورجیئە و نە خەواریج کۆمەڵێك نییە لە ســەدا ســەد بۆچوونەکــانی ئەو دوو تاقمەیــان لە خۆیانــدا بەرجەســتە کردبێــت و هەمووی جێبەجی بکەن، ئەگەرچی ڕێژەیەك لە سیفەت و نیشانە و خەسڵەتەکانیان لە کەسایەتی و کۆمەڵ و تاقمی دیاریکراودا هەیە لەم سەردەمەدا و جـاری وا هەیە وەکو ئەوان و جاری واش هەیە لەوان زیاتر جێبەجێی **دەکەن.**

# جەهمییەکان

جەهمییەکان فیرقەیەکی ترن لەو فیرقەو تاقمانەی کە لە ئیسلام لایانداوە و بە بەشێکی دیاری مورجیئە دەژمێردرێن، ئەم تاقمە سەر بە جەهمی کوڕی سەفوانن کە لە سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا لە خوراسان سەری هەڵدا و شارەزایی لە فەرموودەدا نەبوو، بەڵکو زۆر سەرقاڵی مەنتیق و عیلمی کەلام بوو و هەر لەو ڕێگەشەوە لە ئایەتەکانی قورئان و سیفەتەکانی الله تعالی تێدەگەیشت.

جەهم یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا بڵێت قورئان مەخلوقە و سیفەتەکانی الله ی هەمووی تەئویل کرد و پەکخست و لە واتاکانی خۆیان لایدان، جەهم ئەگەر چی هەندێ لە مێژوونووسان بە کەسێکی شارەزا و خاوەن ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر حیسابیان کردووە، بەڵام لە ڕووی عەقیدەو بیروباوەڕەوە کەسێکی سەرلێشێواو بووەو بەردەوام خەریکی مشت و مڕ و موجادەلە و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی خۆی بووە، سەرەتا بیروبۆچوونەکانی جەهم لە (ترمذ) بڵاوبوویەوە بەڵام دواتر بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ناو خەڵکیدا تەشەنەی کرد، هەر بۆیە زانایانی سەلەف بە توندی بەربەرچی بیرۆکەکانیان دەدایەوە و ورییایان لە بارەیەوە دەدا بە خەڵکی، پێشەوا (أحمد بن حنبل) بەڕەحمەت دەربارەی فەرموویەتی: "وكذلك الجهم وشيعته دعوا الناس إلى المتشابه من القرآن والحديث فضلوا وأضلوا بكلامهم بشراً كثيراً، فكان مما بلغنا من أمر الجهم عدو الله أنه كان من أهل خراسان من أهل ترمذ، وكان صاحب خصومات وكلام" (الرد على الزنادقة والجهمية) (ص ٢٣). واتە: جەهم و هاوەڵانی خەڵکیان بۆ ئایەت و فەرموودە لێکچووەکانی بانگ دەکرد و ئیتر گومڕا بوون و خەڵکێکی زۆریشیان لەگەڵ

خۆیاندا گومڕا كرد و ئەوەشیان پێ گەیشت كە جەهمی دوژمنی اللە خەڵكی خوراسان بووە لە ناوچەی ترمذ و بەناكۆكی و تێوەگلان بە عیلمی كەلامەوە ناسراوە.

جەهمی كوڕی سەفوان لە ساڵی ١٣٠ یان ١٣٢ ی كۆچی لەلایەن (سلم بن أحوز ) لە شاری (مرو) كوژرا. جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن كە كوژرانی جەهم بە هۆكارێكی دینی بووە، واتە بەهۆی لادانەكانی لە عەقیدەی ئیسلامی كوژراوە، شایانی باسە جەهم هاوڕێ و تەلەبەی جەعدی كوڕی دیرهەم بووە و لە پاش كوژرانی جەعد لەسەر دەستی (خالد بن یزید القسري) جەهم لەسەر ڕێبازی مامۆستاكەی هەر بەردەوام بوو، تا دوا جار ئەویش كوژرا.

بەڵام لە هاوچەرخەكاندا شێخ (جمال الدین القاسمی) دەڵێت: كوژرانی جەهم لەبەر هۆكاری دینی نەبووە، بەڵكو هۆكارەكەی سیاسی بووە، چونكە سەرەڕای ئەوەی كە لە عەقیدەی ئیسلامی لایدابوو، بەڵام ئەو بۆچوونەكانی خۆی بەڕاست دەزانی و مەبەستی دژایەتی ئیسلام نەبوو، قاسمی دەڵێت كوژرانی جەهم بەهۆی وەستانی بووە لە ڕووی حوكمی بەنی ئومەییە و ئەو لەبەر بیروڕكانی شایانی كوشتن نەبووە. بڕزانە: كتێبی(تاریخ الجهمیة والمعتزلة) ١٤-١٨.

# نیشانەكانی تاقمی جەهمییەكان

١- هەموو ئایەت و سیفاتێكی الله تەئویل دەكەن و جێگیر كردنی دەست و دەم وچاو تەنانەت قسەكردنیشیان بۆ الله بە كارێكی نەشیاو دەزانن و دەڵێن كەلامی الله لە ناو نەفسی خۆیدایەو ئەمەش دوا جار سەری لەوە دەركرد وتیان قورئانیش مەخلوقە و ئاخاوتنێكی دەروونی الله خۆیەتی!

٢- نكۆڵییان لە سیفەتە ئەزەلییەكانی اللـه تعالی كرد وەكو (القدرة و الإرادة والعلم)، بۆیە دەیانوت الله خاوەن توانا نییە بە سیفەتی قودرەت و توانا بەڵكو هەر زاتێتی و زاتێكی ئەزەلییە بەڵام ئەو سیفەتانە ئەزەلی نین و ئەگەر ئەو سیفەتانەش ئەزەلی بن لەگەڵ زاتی الله ئەوا دەبێتە ڕێخۆشكەر بۆ مەسەلەیەك كە پێیان دەوت (تعدد القدماء).

٣- باوەڕیان وایە كە مرۆڤ بە خۆی هیچ توانایەكی نییە و بەڵكو ناچار و مەجبورە ئەو كردارانەی كە تێیدا درووست كراوە ئەنجامی بدات بۆیە پێیانیش دەوترا (الجبریة) و ئەم مەسەلەش وردەكاری و شیكردنەوەی زۆری تێدایە.

٤- دەیانوت ئیمان تەنها لە دڵدایە و لەگەڵ هەبوونی ئیماندا هیچ تاوانێك تەنانەت كوفریش بە ڕواڵەت و قسەی ئەو خاوەن ئیمانەوە ببینرێت هیچ زیانێكی نییە ، بۆیە بە شێك لە مورجیئەش دەژمێردرێن.

٥- باوەڕیان وا بووە كە الله لە هەموو جیگەیەكدا بوونی هەیە و جەهم خۆی دەربارەی الله وتوویەتی: (هو هذا الهواء مع كل شيء وفي كل شيء ولا يخلو منه شيء). واتە الله ئەو بایەیە و لەگەڵ هەموو شتێكدایە و لە ناو هەموو شتێكدایە و شتیش نییە بەدەر بێت لەو زاتە! بەم شێوەش نكۆڵییان لەوە دەكرد اللـه لەسەر

عەرش بێت و وشەی (استوی) یان لە ئایەتی (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) [طه:٥]،تەئویل دەکرد بە استولی!

٦- باوەڕیان وابوو کە بەهەشت و دۆزەخ هەمیشەیی نین و لەناو دەچن! سەبارەت بە ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بۆ هەتا هەتایی بەهەشت و دۆزەخ دەکات دەڵێن ئەوە بۆ موبالەغە و تێگەیاندنی خەڵکە کە کاتی مانەوەیان زۆر زۆرە بەڵام هەمیشەیی و هەتا هەتایی نییە و هەندێ بەڵگەیان لەو بارەوە دەهێنایەوە.

٧- بێگومان لە ئەنجامی نکۆڵی کردنیان لە ئایەتەکانی ناوو سیفەتەکانی اللە تعالی نکۆڵییان لە بینینیشی کرد لە ڕۆژی قیامەتدا و ئەم عەقیدەیان دواتر موعتەزیلە بەرگرییان لێکرد لەخۆیاندا بەرجەستەیان کرد و بڵاویان کردەوە.

جەهمییەکان بۆ هەموو بۆچوونەکانی خۆیان لە مەسەلەی نکۆڵی کردن لە ئەسمائوسیفات و مەسەلەی جەبر و ناچاری مرۆڤەکان و لەناوچوونی بەهەشت و دۆزەخدا بە دوورودرێژی بەڵگەی قورئان و عەقڵ و عیلمی کەلام دەهێننەوە ، لە بەرانبەردا زۆرێك لە زانایانی ئیسلام وەکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و پێشەوا بوخاری و زۆری تر لە زانا گەورەکان بەرپەرچی ئەوانیان داوەتەوەو یەك بەیەکی گومانەکانی ئەوانیان بە ئایەت و فەرموودە و عەقڵ هەڵوەشاندووەتەوە.

لە دوای کوژرانی جەهم بیروباوەڕی جەهمییەکان کز و لاواز بوو، بەڵام بەتەواوی کۆتایی پێ نەهات و هەندێك لە بیروباوەڕەکانیان لەناو تاقمی موعتەزیلەدا ڕەنگی دایەوە وەکو خەلقی قورئان و هەندێك لە بۆچوونەکانی تریان دەربارەی سیفات.

بە كورتی: جەهمییەكان بنچینەی هەموو گومڕایی و لادان و شێواندنێك بـوون لە ئیسـلامدا و پێشـەنگیش بـوون بـۆ گومڕاكـانی دوای خۆیـان، چـونكە فیرقەیەكـی كەلامی بەتوانا بوون لە مشت ومڕ و سەرلێ شێواندن و گومان درووست كردندا

